# بەیان



ژ (98) ئەیلولی 1984







بەدەستی
دەجەنگین
بەدەستی
بنیاد ئەنێین

بەیان

گۆڤارێکی مانگانەی ئەدەبییە

سەرەکی ئەنجومەنی کارگێری
وسەرنووسەر

مصلح جەلالی

سکرتێری نووسین
محمود زامدار

نەخشەکێشان و سەرپەرشتی هونەری
هناء صباح
خەت و مۆنتێف:
نزار بەزاز

دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی
.مەیدانی خەلانی ـ بەغدا ـ
ت 8875795 (5) خەت

لەم ژمارە یەدا



تکاوگلەیی

تکـایـە هەر نووسـەرێ خەتـەکـەی خۆش و شاش و جوان نەبێ، نووسینەکەی دەخرێتە پشت گوێ.

## بە بۆنەی تێپەڕبوونی چوار ساڵ بەسەر جەنگدا

# کێ شەڕی

ئاشکراو ڕووتە فتیلی شەڕی نێوان عیراق و ئێران کێ هەڵگیرساندووە. . !؟

بێگومان لە سەرانسەری جیهاندا ئاشکرایە نەخشەیەکی فراوان لە لایەن ئیمپریالیزم وزایۆنیزمەوە کێشرا بۆوەدەرنانی شای گۆڕ بە گۆڕ کراوی ئێران هاوردنی شای مێزەر بە سەران لە پەنا پەردەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامی یەوەو هەروەها هەڵگیرساندنی شەڕی نێوان عیراق وئێران ئەوە بوو خۆمەینی خەڵەفاو لە پاش وەرگرتنی جڵەوی فەرمانڕەوایی لە ئێراندا نەیتوانی بچنە ژێر باڵی فەرمانڕەوایی ، یان بە شێوەیەکی ڕاست و ڕەوان دانی پیا بنێن و باوڕ بە دەف ودهۆڵ لێدانەکەی بکەن کە بە ناوی پیاوێکی ئاینداروموسلمانەوە فووی پیایە ئەکرد گوایە ئەیەوێ چوکمێکی موسلمانا لە ئێران و سەرانەری جیهانیش دابنێ. بە پێی ئەونەخشەیەی کە لە تۆوی مێزەرە سیحراوەیەکەیدا ئاخنزا بوو، پێ پشوودان ڕاستەوخۆ دەستی بە کرداری ناڕەواو کاری ئاژاوەچێتی و دەست درێژ کردن بە رانبەر عیراقدا کرد. ئەوە بوو چەندین شارو دیهاتەکانی سەر سنووری عیراقی بەردوومان کرد، بێ ئەوەی عیراقی بە تواناو بە هێز وەڵامی بداتەوە بێ یەك ودوو سوپا بەزیوەکەی و پاسدارە خۆینمژەکانی خزینە سنوور.

بێگومان عیراقی بە هێزو پایە بڵند نەیئەویست لە گەڵ ئێرانی هاوسی دا تووشی جەنگ ببێ و کێشەیەك لە نێوان دوو دەولەتی دۆست و موسلماندا ڕوو بدات.

ئاشکراشە عیراقی نوێ هەر دەم حەزی کردووە گەلانی ئێران بە ئاسوودەیی و هێمنایی لە ژیانێکی خۆش گوزەرانیدا بژین. بەڵام ئەم کۆمەڵە نەفامەی تاران وقوم ڕێزو دۆستایەتی دوو وولاتی دۆست و موسلمانیان نا؟ لاوەو زیاتر خۆیان بۆ دەسدرێژ ی ی توندو تۆوڵ کرد و هەڕەشەی لە بنە بڕ کردی عیراقی نۆیان ئەکرد. سەرەرای ئەم هەموو کردارو رەفتارە ناڕەوایانەی رژێمی مل **هوری** ئێران عیراق چەندەها هەوڵ و تەقەللامی دا بۆ دامرکاندی گوڕی ئاگری شەرخوازان؟ بەڵام سەرەنجامی هەموو

# هەڵگیرساندن

**عثمان حمد**

هەوڵــدانێـك بێ فایـدە. چونکـە هەر لە سەرەتـاوە ئەوان بڕیاری شەڕکردن و دەسدرێژ کردنیان یبۆوە.

لێـرەدا پرسپـارێـك خۆی لە بەر دەممان دەچەقێنێت و دەڵێ؟ ئایا بە هەڵگیرساندنی ئەم شەڕە شتێکیان وە دەست هێنا..؟

دیسـان ئەڵێین با خۆمـەینی و گەجـەرو گوجـەرەوکـانی تاران و قوم وەڵامی ئەم پرسیـارە بەتـەوە ئەگەر خۆشیان لێ گێـڵ و چاوبەستـراوە ئەکـەت داستـانـەکانی ڕۆژهەڵاتی بەســرەو گۆمی حوێـــزەو گەژ ی گردەمـــەنـــدو مەنـدەلی ئەنجـامی خەونـە پوچـەڵـەکـەی خۆمەینی ی نەفام و ئازاو دلێـرێتی جەنگـاوەر بە جەرگـەکـانی عیراقی نۆی دەخاتە ڕوو.. هەر جەنگـــاوەرێـك لە جەنگـاوەرەکـانی عیـراق چەنـدین چیـرۆکی ئازایـەتی و پاڵەوانێتی لە ڕوو بە ڕووی سوپـا بەزیـوەکـەی و پاسدارە خوێنمژەکانی تۆمار کردووەو هەر بستێ لە سنووری عیراقیدا بۆتە تابلۆیەکی یادگاری مێژوویی ی...

ئەمە لە لایەك لە لایەکی دیکەوە گەلانی ئێران بە هاتنی ئەم ئەڵقـە لە گوێیـانە وایانزانی بە ئومێدو خواستی ڕەوایان گەیشتن و خوێنی ڕۆڵەکانیات بە فیرۆ نەچووا!!

وایـانـزانی ئەونێـزەیـەی بە خوێنی منالآنی نێو بێشکە سوور ببـــوو خرایـــە قوڕگـــی بەدکـــاران و تۆڵـــەی سەنــــدرایـــەوە...!! وایـــانـزانی برینی دایکـە جگـەر سووتاوەکان بۆ یەکجارەکی سارێژ کرا...!!

وایـانـزانی لە باتی خوێنی باوکـە خۆبەخت کراوەکان مژدەی ئازادی و سەربەخۆیی یان پێ ئەبەخشن!!

بێجگـە لە مانـەش چەنـدین ئاوات و خواستی تریـان ڕەچـاو کرد بوو... بەڵام بە پێچـەوانەی ئەم هەموو ئاواتە خۆمـەینی گەندەڵ و دەسوودایەرەکەی وەك گورگی برسی کەوتنــە نێــو گەلانی ئێــران بە کەیف مەرامی خۆیـان و ئاغـانیـان دەستیـان بە سکنای تێکدان و کوشتن و برین و دەر بە دەر کردنی گەلانی ئێرانیان کردو تەواوی دڕندایتی و بەد فەڕیان بۆ هەموو جیهان کەوتە ڕوو.

# وەرزێت سالێ

# ل مهابادێ

• بدل مزوری •

هو خەلکینو. . . . .
ئەرێ ببینن دیمەنێ وەلاتێ من تێدا دژیت
کول وژانا ئەودرێژ یت
هەوار. . . . هەوار
ئەوچ کولن. . . . . !
ئەوچ ژانن. . . . . !
چ ئاخینکن. . . . . !
کەڤر دگرین و دحەلێت
نەبوهارا وەلاتێ من وەك بوهارا جیهانێ یە
ئەم دزانین ل بوهارا. . .
عاشق بوخانمێت خوسترانا دبێژ ن
سروشت و پەری وزەری دڤەدگێرن
بلبل ئاوازەکێ جوان دهنێرن
بوچیروکەکا ڤیانێ. . . مم وزینێ
ئەڤرو. . . .
ل بوهارا وەلاتێ من رەش و شینی یە
هەمی لایا کوزرینا دلایەو گرینی یە

بوهار بوری وهاڤینێ سەرمەدا هەلات
بو مێڤان و ئەم پێ خوش بوین
چ دیاردبیت. . . . . ؟!
چ هاڤینە. . . !
ل هاڤینا کورێت وەلاتا دگرن رێکا دەریا
سەخمەراتی بوراندنا روژا ب مەلەڤانیا
ئەگەر بێنە وەلاتێ من ئەو دەرێت مە
ئەڤرو جوکێت خوینێنە. . . . ، ەری دسورن
مەلـەڤانیاتێدا دکەین ناخەندقین خوینا سور رێیەرا
رێکامەیا درێژە
ئەڤ ئالامە نەخشان دی یە بڤێ خوینێ
هاڤین هوسا مەبوراند بن سیبەرا دارێت وەلاتی
هاڤینێ خاتر خاست وچو
هاڤین دچیت. . . پاییزتێتن
ل پاییزێ دار دهەژ ێین. . .
بەلگ دوەرێین. . . .
ئەگەر سەحکەینە پاییزا وەلاتێ من





دێ بینین گوللەو ناپالم ئەون دوەرێین
ئەو نە بەلگن. . . .
دسوژ ن ئەو چادرابتنێ بومەمای‌و لبن دژین
هاتە سوتن. . . . بەلەنگاز بوین

هێلین هەرفت. . .
چ پاییزبو. . . !
چ مێڤانی بو. . . . !
چ وەرزبو. . . . !

شەڤەکا تاری تارستانێ دەزێت خو بەلافکرن
هەر وەسا مالامە هەمیا خوکوم کرن
تا هواری‌یێ بگەهیننە زستانێ
هیڤێ دکەین بارانەکێ فرێ بکەت

تا ئەو گولێیت گەنمی بژێن. . . .
ناف زەڤیکێت دلێ مەدا. . .

ل دیماهی‌ێ بکەینە نان. . .
بو برسپاپاو بەلەنگازا. .
هەوارە. . هەوارە ئەسمان
ئەو گولێ دهناڤێت مەدا دسوتن
بارانامە ئەڤرو ئاگرە. .
ئەرێ ژەهرە.



ئەرێ ئەڤرو مە ماچیکر
ئەنیا دەیکامە وەلاتی.
ماچ ژی سوزبو. . .
ژ بو هەلاتنا روژەکا نوی
بو زاروکێت ڤی مللەتێ
گەل سترانەکێ و نانەکێ
ئەوێ سترانێ دێبێژین
گەل‌هارنا نانێ بسەربەستی
بسەر بلندی. . . .

# تازە دەستگیران



پێشکەشە بەو پاڵەوانانەی کە کوشندە دەستی جەزرەبە لەو نەفام و گەوجە دژ بە شارستانیەت و پێشکەوتن و ئازادی گەلان . . دەوەشێنن و لەسەر شەقام و کوچەو مزگەفتەکان . . لە گشت شارو شارۆچکەو گوندێکی ئێران بە جەهەندە میان دەسپێرن .

شەپۆلی قین
لوتکەی مەبەست
چاووی بیری پرشنگ داوەو
لە ئاسمانی «ئازادی» ئەکا
پاییز ـ زستان ـ بەهار ـ هاوین
گاسن ئەکات بە تفەنگ و
خوێنی جوتیارە ـ کوردوستانی ئێران ـ ئەشواتەوە

× × ×

ئەمرۆ دەنگی
زانست و فەلسەفە ئەدوێ
جادوو و گیانی چەپەڵی
ئەهریمەنی (لاپرەسەن) بە تاران و قوم
دوێنێ و ئەمڕۆی هەموو ئەشواتەوە

× × ×

ئەمرۆ گۆرانی ـ تازە دەستگیرانێ ـ ئەخرۆشێ
لە ژیانی ژێر سایەی حوکمی خووم وەسەر
یاخی بووەو
ژانی گشت گەلانی ئێرانیش ئەخواتەوە
ئەیەوێ ئێران . . . .
ئێرانی کوردو عەرەب ، بلوچ و تورك

بیتە دەریا
بیتە چیا
بیتە سەوزی
بۆ مرۆڤی هەموو ناوچە

ـ حەسەن مەحموود ڕەسوڵ ـ

# دەنگ و باسی ئێستای ئێران چی دەڵێ..؟

**ئایا لەم ڕۆژانە دەنگوباسی ئێران چی‌یێت ؟ مێژمرلەسەرەکان چی‌دەکەن .. ؟**

**چ چارەسەرێکیان بۆ ئێرانی شـــلەژاوی لێ‌قەوماو دۆزیوەتەوە .. ؟**

**یەکەم :** ســـوپای ئێـــران بوەتە چەنـــد بەشێکەوە ، رژێمیش دەســـــتی کردۆتە گرتن‌و کوشتنی ئەوکەسانەی بەتایبەتی لە ســـەرکردەی سوپایدا کە بە ئاشکرا نارەزایی خۆیان بەرامبـەر بەم ڕژێمە بۆگەنە دەربڕیوە .

**دووەم :** ڕژێمی تاران لیســـتەیەکی نوێی بۆ خزمەتکردن لــە سوپادا پێشکەش کردووە ، ئەمەش ئەوە دەردەخات تا چ ڕادەیەك کوشتاریان زۆر بووەو خومەینی ناتوانێت چۆن ئەم بۆشـــاییە لە کەرتەکاندا پڕبکاتەوە ..

**سێهەم :** خومـــەینی توشی نوشـــتی بـــووە بۆدانانی جێگر بۆخۆی چونکە رای کەســـــــی وەرنەگرتوەو لەچواربالا دەنگی نارەزایی‌و تـــورەیی بەرز بۆتەوەو خومەینییان لەم بارەیەوە تاوانبـــار کردووە .. خەلکەکەش نایانەوێ کەسێکی‌تر بێت حوکمی ئێران بکات لەچەشنی خومەینی چونکـــە دیـــان دەبێتە هۆی وێران کردنی ئێران زیاتـــر گەلی ئێران توشی هەژاری‌و برســـــێتی‌و نەخۆش ماڵوێرانی‌و جەرگسوتان دەبن .

**چوارەم :** ســـــــەرەك رژێم « خامنەئی » ناتوانێت بە چەشنێکی سەربەستانە بجولێتەوە ، چونکە لەولایەوە ڕەفسەنجانی ڕاوەستاوەو گشت دەسەلاتێك لای خۆی‌و ئەم هیچی بەدەســــــت نەماوە ..

**پێنجەم :** جموجولی کـــوردەکـــــان لــــــە زیادبووندایەو توانیویانە گەلێ ناوچەی بگـــرنــــــە دەست‌و هەر رۆژ ژمارەیەکی زۆر لـە پاسدارانی خومەینی‌و سوپاکەی تەفروتونا دەکەن‌و بونەتـــە کۆســــــپێکی گەورە کە ڕژێمەکەی هێناوەتە شلەژان‌و شپرزە ..

کوردەکان داوای مافی ڕەوای خۆیان دەکەن، خومەینی‌ی جادوگەر ڕۆژ دوای ڕۆژ زیاتر بەتوندی مامەلە لەگەلیان دەکات‌و هەرکەســـــــێکی چنگ بکەوێت بێ سێ‌ودوو لەناوی ئەبات .

جا براکوردەکانمان لەوێ بـــەوپـــەری هێـــزو توانایانەوە دەستی پالەوانانەو مەردانە لەســـــوپا شەل‌و شۆقەکەیان ئەوەشێنێ .

**ئینجا خومەینی ئـــەیـــەوێ باری ژیان تۆزێ باشکا پاسەوان زۆر ئەگا نازانێ زۆری پاســــەوان تەنگوچەلەمەی زیاتر بۆ زیاد ئەبێ هەرکـــــەس ئەیەوێ خۆی زیاتربێ لەوی تر و خراپەکاری زیاتر بلاو ئەبێتەوەو ئاژاوە لەبەینی پاسەوانانا زۆر ئەبێ هـــەر ئەبێ بـــە عەقلە خلەفاوەکەی خـــەریکی ڕێکخستنەوەی پاسەوانەکانبێ ئاگای لــــە هیچ خەلـکی ئێران نەماوە . بەم جۆرە هەتابێ ئێران بەرەو کەوتن‌و نشوستی ئەچێ بەئیزنی‌خوا .**

**● هاورێ احمد ●**

# لاپەڕەیەك لە ژیانی كوردستانی ئێران

● تاهیر عوسمان محەمەد ●

لێزمەی بارانێکی بەهێز، ئاوڕشێنی کۆڵان و بەردەرگاکانی دێی (ن)ی ئەکرد، لادێییەکان لەدەوری سۆپای داری دوکەڵاوی خۆیان گرمۆڵەکردبوو، منداڵەوردەکان گوێ قولاخی قسەیەکی سەیروباس و بەسەرهاتێکی کۆن بون، کەئاسایی گەورەکان لەشەوانی درێژی زستاندا ئەیان دا بەگوێی زارۆکەکاندا، ، ، . لە دەرەوە بارانێکی بەگوڕ دایئەکرد هەرچەندە دەستی لادێییەکانی ئەگرت لەڕاپەڕاندنی چەندئیش وکارێکی ڕۆژانەدا بەڵام ئەوان بەدیاریەکی بەنرخی سروشتیان ئەزانی دیاریەك کە بۆوەرزێر هیچ شتێك نیە خۆی بدا لە قەرەی ئەودا، کە بەهۆیەوە دەغڵ و دانیان سەردەرئەکاو بەری ڕەنجی ساڵێکیان لەمەوە ئەبینن بۆیە باران بۆجوتیارو لادێییەکان خێروبەرەکەتە لەخانوە لاکێشەییە دەرگا کلۆم دراوەکاندا ئاژەڵ تێرکرابوون مەڕومالآت، ڕەشە

وولاخ، پەلەوەر بەجیا داکرابوون، وەکو پیشەی چەندساڵەی زستان گەورەو بەناو ساڵ کەوتوەکان قسەوباسی کۆنیان بۆ نەوەکانیان دەگێڕایەوە کەزۆربەیان باسی ساڵانی نەهاتی و مێرفارسی و قارەمانێتی باب وباپیران وگیانی ورەبەرنەدان و مێژ وی پڕلەشکۆو شانازی گەلەکەمان بوون. لەودیو قەمتەرەی

کلۆم دراوۆدا چی بایەو، چی ڕویدایە کەس ئاگای نەئەبۆوە، ججای لەشەوە بارانێکی وا، کە گرمەوهۆڕی هەورە تریشقە دونیای تاریکی ئەکردە ڕۆژی ڕوناك، ئەوەی باوبوو لەناو لادێییەکاندا تا بۆیان ئەکرا یارمەتی یەکتریان ئەدا، بەعەیب و





دەردی یەکتـر شارەزابـوونە، ڕوخـۆش ودەم وڕووراست و ئازاونـەترس بوون، یەکگرتوو، سەرشۆڕنەکردوو بوون بۆهیچ هێـزو لایـەنێـك. شەوراکشـابـوو. مەجلیس ودانیشتنەکانی دەورەی ئاگـر دانـەکان خەریك بووکەم ئەبۆوە. دەنگی چەند تەقـەیـەك بیسترا، ، ، ، . . . . هەمـوو وروژان!! چەنـدەها نیشانەی پرسیار بەرویانا دیاری ئەدا، چین؟؟ وبەتایبەتی لەم وەختە، ؟؟ هیچمان لەبارانیە!! هەربەشی زستانمان خۆراك و پۆشاك ماوەو نەماوە، چی یان دەبینێ؟؟؟

بەڕ ورەکـان کەوتن، خۆیـان، چاك، ئەیـانناسن کێن، ئەوانن، سوپـای ئاخـونـد، سوپـای برسی ولەرکەتووی کلیل لەمـل، کێن؟ تالان کەرن، دام دەستـەومل هوڕانی ڕژێمی ئاگروئاسنن، دوبارە، بەناوی یارمەتی، سوپا، ئالەم «زستانە تووشەدا» لەم قات وقریەدا داوای پۆشاك وخواردەمەنی وبگرە سەربـازیش ئەکـەن، ناگـێـڕێتـەوە، باسـی ناکـرێ، چی یـان کردو، چی یـان برد، چۆن دەیـەهـا منالّی بچوکیان، بێ خـۆراك وپۆشـاك بگـرە بێ بـاوك جێ هـێشت مەگـەر نەوەی داهاتوو، بەچیرۆك ئەم بەسەرهاتە بگێڕنەوە.

ئاشکـرایـە تەمـەنی هەرچل شەوە بەهـاری ڕەنگین، ڕۆژی شـادی هێـنا لادێ ئیـدی چیتـر سوپـای لەرِوتێك شکاو توانـای نەمـا پەلامـار بداتـەوە، خەلّکی بەشادی ژیاو هەمیشە بەشـادی ئەژی بەهێـزوتـوانـای نەوەشێـرانیش هاکـەبیستت رژێمی ئاخوندی خوندکار تەخت وتاراجی پرماو لەشوێنەکەی ئاگرێکی گەورەی بڵێسەدار هەڵکرا.

# گەلی کوردمان و قادسیەی صدام و گەلانی ئێران و ڕژێمی خومەینی

● اسماعیل گیلانی ●

پاش شۆرەشی 17 ـ 30 تموزی نەمر لە مێژووی عێراقدا لاپەرەی مافی نەتەوەی گەلی کوردمان وەدەر کەوت و پرکراوە . کە گەلی کوردمان مافی خۆیەتی وەرگرت وشان بەشانی برا عارەبەکانی وەستا دژی هەموو پیلانەکانی ئیمپریالیزم و زایۆنزم و هەموو زۆردارێك دژی عێراقی خۆشەویستمان . . گەلی کوردمان زۆر لەکۆنەوە ئازایەتی و پیاو چاکی لێ دەرکەوتووە کە گیانی خۆیان لا هەرزانترین نرخ بووە بۆ خۆبەخت کردن لەرێی وولاتی خۆشەویستی عێراقی مەلبەندی بەچکە شێران . وەبەرگریان کردوە لەخاکی زێرینیان شان بەشانی برا عەرەبەکانی بۆ پاراستنی شەرەف و کەرامەتی هاولاتی عێراقی خۆشەویست وە لەهەموو کاتێکا بەرپەچی دەستەی زۆردارانی داوەتەوە کە ویستویانە چاوچنۆکی بکەن خاکی بەپیتی عیراق . . وە ئەم خۆبەخت کردنەو دلسۆزیەی گەلی کوردمان کە لەمێژووی عێراقدا ئەزرەنگێتەوە ئەوکاتەبوو کە بەیەك هێزو تواناو بەیەك بیروباوەر لەگەل براعەرەبەکانی و هەموو کەماتیە براکانی ترەوە بۆهەموو جیهانیان سەلماند کە گەلی عیراق یەك گرتووەو یەك بیرو باوەرەو یەك هێزە بەسەرکردایەتی سەرۆك ی پێشەوا صدام حسین . کە لە رۆژی 4 ایلول سالی 1980 فارسەتوخم پەرستەکان دەستی دوژمنکاریان بۆ سنوری وولاتمان دریژکرد وەدەستیان کرد بە بۆردمان کردن و هێرش هێنان بۆسەر خاکی عیراق بەونیازە کە خەونە پوچەلەکانیان بەدی بێنن . . ئەمەش شتێکی سەیر نیە کە ئەلێم خەونەکانیان بەدی بێنن وە خاکی عیراق داگیر بکەن چنکە هەموومان ئەزانین کە عەجەمە رەگەز پەرستەکان هەر لە کۆنەوە چاو چنۆکیان کردۆتە خاکی بە پیتی عێراق و ئاو سامان زێرینەکەی بەلام هەر چەند توخم پەرستان لە کۆنەوە وەلە تازەوە هەولیکیان دابێت هەر سەر شۆریان بۆ ماوەتەوە بە هۆی زەبری زەندو بازوی رۆلانی عیراقی دلسۆز بۆ نیشمانی خۆشەویستیان هەر لە کاتی قادسیەی یەکەم کە چۆن ئەم رەگەز پەرستانەیان سەر شۆوری مێژوو کردو خەونەکانی کسراو رۆستەمیان بە ئاوی رۆیشتودا هاوێشتبێت کە هەتا هەتایە ناگەرێتەوە . . ئەگەر بۆ جارێکی تریش گەرابێتەوە دیسان لە قادسیەی صدامدا لە مێژووی ایستا جارێکی تر ئاگادارمان کردۆتەوەوە سەر لە نوێ سەر شۆری و پەنجەگەستنیان بۆ ماوەتەوە . . بۆ ئەم مەبەستەشمان هەر لەو کاتەی کە رژێمی شاهی گۆڕ بە گۆڕ روخا وە رژێمی شاه خومەینی هاتە سەر هەمان تەخت و تاراجی شاهی براکەی بەلام لە شوێنی تاج لە سەر نان و جل و بەرگی شاهاتی بە مێزەر و بەرگی مەلایەتی خۆی داپۆشیوە بۆ ئەوەی لە ژێر پەردەی ئایینی ئیسلامدا پیلان بگێرێت وە ئمپراتۆریەتی خۆی فراوان بکات . ئەوەبو هەر لە سەرەتای دانشتنی لە سەر کورسی شای پێشو دەستی زۆرداری درێژکرد بۆ وولاتانی هاوسێی وەلە پێشەکی هەموو وولاتەکانی هاوسێی دەستی بۆعیراق درێژکرد چنك و ئەزانێت عێراق بەهێزترین وپێش کەوتوترین وئازاترین وبە تواناترین وولاتە لە ناوچە . . ئەوەبوو هەموومان ئەزانین کە سەرەتای وەدەرخستنی زۆرداریەکەی خۆی چۆن کارێکی ناکەزبەچانەی خولقاند لە زانکۆی مستنصریە لە بەغدا وەزۆرەها کاری هیچ وپووچی ئازاردانی هاولاتیانی عێراقی بە جێ هینا بە تاوانی چەپەی لە شارەکانی وولاتەکەمان . . دوا بە دوای ئەم کارە درندانەی ئەوەبو کە زۆرداری کردە سەر سنوری رۆژهەلاتی وولاتمان وەدەستی کرد بە بۆردمان کردنی شارو دیهاتەکانی سەر سنورمان پاش ئەوەی کە چەند جارێك

ئاگـادارمـان کردبـونەوە کە ئیمە نیازی شەرکردنمان نیە . بەلام هەرچەند ئەم بانگەوازەمان راهێلا هیچ چارە نەبوو شەریان بە سەر فەرزکـردین لە نیـازی خاوەکـەیـان وایان ئەزانی کە گەلی عیـراق شەری بۆ ناکـریٚ و ریگـاش فراوان ئەبێت بۆ هاتنـە ژ وورەوەی نیـو خاکی نیشتمـانمـان و داگیـرکردنی . . . بەلام ئەوەی کە مێشکی بوگـەنی خۆیـان چانـەبـوو بە هەمـان شێوە بۆیـان نەدروایـەوە . . ئەوەبـوو کە سوپـای نەبـەزمان بە ماوەی چەنـد سەعـاتێـك لە سەرەتـای دەست پیٚ کردنی جەنگ چەنـدەهـا شارو دێهـاتیـان لیٚ داگیرکردن وە هەلاٌتن و پاشووە چوون بوو بە شتێکی رەوشتـەی خۆیـان چنـك و ئیمـە لە سەرحـەقین وە لە سەرەتـاوەش هەر لە سەرحـەق بوینـەو هیـچ کاتێکیش نیـازی دوژمنـداری و چاوچنـۆکیمـان نەبوە دەرحەق وولاتـانی هاوسیٚ زیـاتـر لە چاکـەو ریز گرتنی مافی دراوسێتی بۆیـە رۆلانی عێـراق بە بیـروباوەرێکی دلسۆزانەو راستەقینەی نەتـەوەی و نیشتمـانی یـەتی یـەوە بەرگـری لە مافی نەتـەوایەتی خۆی ئەکـاتـن لە پێنـاوی ئەجـەنگێـت و گیـانی خۆی بەخت ئەکـاتن بەلام بابلێین ئایا لەشکرە شرەکەی ایران بۆ کیٚ ئەجەنگیٚ وە بۆچی ئەجەنگێت؟ . . هەموومان ئەزانین هەر لە رۆژ ی یەکەمی هاتنی رژێمی خومەینی سخرباز چی بۆ گەلی ئێران کردوە؟ . . یاخووت گەلی ئێران چ بایەخێکی لەم رژێمە بوگەنە وەرگرتووەو دیتووە؟ . . لە وەلامدا ئەلێین هەر لە رۆژ ی یەکـەمی هاتنـە سەر کورسی حوکمداری ئەم رژێمە بوگەنە لە گرتن و کوشتن و برین و لە سێـدارەدان و بەنـەکـردنی رۆلانی ئێـرانی و لە ناوبـردنی باری کۆمـەلایـەتی و کزکـردنەوەی باری ئابـووری لە ئێران زیاتر هیچیان نەکردوە سەرەرای ئەوەی بگرە کە لە عەرەبستانی ئێران تاوەك و کوردستانی ئێران کردویەتی بە یەك جوگـەلـەی خوێن . جگە لە شارەکانی تری ایران کە رۆژ نیـە چەنـدەهـا لاو لە سێـدارە نەدرێت وە ئەم کارەش هیـچ سەرسورمانێکی بۆ ناوێت چنکە کارێکی پیشەیی رۆژانەی ئەم خوێن مژانـەیـە . . لەم کارە درنـدانەش جوانترین پیشەی ئەم دەستـە خوێن مژانـە ئەوەیـە کە ئافرەتی سك پرو پیاو بە تەمەن پەك کەوتـووە منـالی ساوا لە سێـدارە ئەدەنـە بە بیٚ هیـچ دادگەیەك و لیٚ پرسینێك و لیٚ پێچانەوەیەك ئەمەش کارێکە کە لەگـەل هیـچ خوورەوشتی مرۆڤـایـەتی و مافی مرۆڤـایـەتی ناگـونجیٚ و نەگـونجـاوە . جا ئەگـەر رژێمێك هەر لە سەرەتای دەسـەلاتـداری خۆی ئەمە کارو پیشەی بێت دژ ی هاولاتیانی چۆن تەمـەنی درێـژ ئەبێت؟ . . مەبـەستیشمـان رژێمـە بوگـەنـەکـەی خومـەینیە . . نەخێر ئەم رژێمە خوێن مژە هیچ تەمەن درێژ یەك بۆنیە وەلە ناوچوونی زۆر نزۆك بۆتەوە . چنکە لولەی تفەنگی حەق لولەی تفەنگی هێزی بەرهەلستکاری ئەم رژێمە بۆی ئاشکرا بوو کە ئەم رژێمە بۆ بەرژەوەندی خۆی یەك کەس بە تەنیـا لە ئێـرانـا ناهێلێت وەبـەکوشتی ئەدات و هەموو حەقیقەت و راستیەکی لە گەلانی ئێرانی شاردۆتەوە بۆیە زۆری نەمـاوە گوللەی لولـەی هێـزی بەرهـەلستکـار بتـەقێتـەوەو ئارمـانجـەکـەش پەرت پەرت کردنی جەرگی خومـەینی و ئەم دەستـە خوێن مژانـەیـە کە دانشتـوون بە خوێن گەلانی ئێران خۆیان قەلاو ئەکەن لە ناوچونیشان بۆتە ایٚستا نا ایٚستاو گەلانی ئێران لە دەستیان رزگار ببن و داوەکەیان بپچرێت و هەموو گەلە بەش خۆراوەکـانی ئێـران بگەن بە مافی نەتەوەی خۆیان . . . سوپـای قارەمـانیشمـان هەر بەردەوام ئەبێت لە تومـارکـردنی داستـانی رازاوەتـرو مێـژ ووی تـر هەرچـەنـد جەنگ بخایەنیٚ وەدیـسـان گەلی عیـراقمان لە ژێر ئالاٌی پارتی بەعسی عەرەبی سوشی لست بە سەرکردایەتی پێشەوای تێکۆشەرو شۆرەسواری نەتـەوە صدام حسین بەردەوام ئەبێت لە لێدانی زەبری بەهێزتر لەم دوژمنە رەگەز پەرستانە تاوەك و سەرکەوتنێکی کۆتای . .

هەزاران سلاو لە گیـانی پاکی شەهیـدانی قادسیەی صدام نەمـری و سەربـەرزی بۆ ئەو شەهیـدانـەیـە ئەوانـەی لە ریٚی سەربەرزی و سەرفرازی تیٚ کۆشان بۆ وولاتیان و نەتەوەیان . . مردنیش پاش رووڕەش بۆ رژێمی تارانـە وەلـە سەرویـانـەوە جادوگەری گەورە خومەینی خوێن مێژ . . .





# بو بهارەکا زەر ل عەردەکێ کەسک

ل سپێدێ گەل ڕۆژهەلاتێ
ل سئەقامێت چار چرادا
دەنگەك هات و بلند بووە
ئەڤـــە تەرمێت چەنـــد کوردێت شەهیـــد کری پێـــك ئێێن
کورێت قازینـــە، شۆڕشگێـرن، ئازانـــە، زیـرەکن، ناتـرسن
سنددینە درێکا رژێما خومەینێی خین مێژدا
هەمی ئارمانج و خیچکێشێت وان پرچاندن
کرێ گرتێیت خومەینی ئالۆزکرن و گێژکرن
بەلێ چ ب بێژین دەردێ وێ کلیلا بستایێ وانڤەگەلەك گرانە
ڤێجا براستی ئەڤ کەسە گەلەك تەپەسەروو سەرڕەڤن تێهنێیت
خینا ئازەربەیجانیاو بلوشاو عەرەب و کوردانە
بەلێ لسەر لەشێت ڤان شەهیدا جان نڤیسی بوو و ئونەخشاندبوو
سیند بەهەمی بیروباوەڕا، شوڕشگێڕا، بەقازی، ئەردەشێر، شێخ سەعیدێ نەمر،
پێویستە ئەڤرۆ لماهابادێ کوردستانا ئیرانێ
روهن بیتـەڤـە شەقـامـا چارچرا بخینا چەند گەنج و طولازێت
یێت کوردا

× × × ×

ئەڤ شەهیدە هەمی ژنك و بچیك بوون
کەفتینە بەر هەرەشەی ڕەشەبای ناپاکی دەڤی خومەینی



**عەولای حەمەیی**

بوو نەهێلانا توٚڤێ کوردا .
چونکە گوایە کورد کوشتنیش هەر غەزایە
نی کردنەوەی ڕووداوێت کەربەلایە
بەلێ نزانن کوو خودێ دبێژیت .
« ولاتقتلوا النفس التي حرم الله إلا بالحق »
کەوا ئەڤەش هەر فەرمانا خودێیە
ڤێجا هەی ریهـ پیس
گەنگیت ئیسلامێدا کوشتنا ناحەق وارەوایە
کورد کوشتنیش کەنگی غەزایە
هەبی و زیندان بوو مروٚڤ حەق خاز کەنگی دانایە
بەلێ دیارە کوو خیچکێشێت تە بوٚ کوردا

هەمی درەون
هەمیێت پیچن دگەل هەوای دچن
بەلێ خینا هەر کوشتیەکی ، شەهیدەکی ، چاك بزانە
وەکی باخچێت گولاشین دەبنەڤە ل بهارا
دڤی وەختیدا ئەی خومەینی ، پاسداران دیڤەلاتك و خوین خواران
کیڤە دچن
هەمی ، گشتی هەر تفەنگە
هەرچی ڕەخەکی بچنێ هەوارووە دەنگەدەنگە
دبێژ ن یان مرن
. یان سەربەستی یا کوردستانا ئیرانێ




پێشکەشە بەو زولم لێکراوانەی کە بە جەورو ستەمی رژیمە چەنگە بە خوێنەکەی خومەینی هەترەو ئاوارەی شارو ولاتان بوو ـ ون .

هەموو شەوێ
شۆڕە کچە چاو ڕەشەکە
پێم دەڵێ : بۆ
من تۆزقاڵێ لە سووتانی تۆ تێ ناگەم
من لە عیشقی شیعراوی تۆ سەر دەرناکەم؟
کە جێم دێلێ هەر خەمباری،
کە دێیتە لام هەر خەمباری
هەر چەند لە شەوانی ژ ووانا
مەمکەکانم بۆ تۆ دەکەم بە دوو مۆم و
پرچە ڕەشماڵەکەی خۆمت بۆ هەڵ دەدەم
هەر خەمباری!
هەر چەند وەك مار
خۆم لە بالآت دەئاڵێنم و ماچت دەکەم
هەر خەمباری!

ـ شۆڕەکچە چاوڕەشەکە :
ئەمن هێندە . .
عاشقی شاخ و چەم و بەفرم
ئەگەر رۆژێ لێیان دووربم
وەك پەلە گەنمێکی بێ ئاو
زەرد هەڵ دەگەرێم و دەمرم .
شەوان نانوم
تا بلوێرەکانی کێوی بۆم نەخوێنن
شیعری ناڵێم
تاکو پشکۆی خەمەکانی ئەم شاخانە
سییەکانم نەسووتێنن .

ـ شۆڕەکچە چاوڕەشەکە
چۆن دەتوانم ماچت کەم و خەمبار نـ
ئەگەر خەمێ بمسووتێنێ
لە عیشقی تۆ بەتین تربێ؟!

ـ شۆڕەکچە چاوڕەشەکە :



که دوێنێ بەیانی دەچووم
گوێ هێرۆی ڕەنگاوڕەنگت بۆبهێنم،
ییم:
کچۆلەکی تریفەدار. . .
سەرکانی دانیشتووە. . .
هێنی هێدی
دەستە زیوینەکانی خۆی تەردەکات و
ە بسکەکانی دادێنی،
هێدێ جاریش. . بە بێزاری
ڕوو دەکاتە ئاسمان و
می ئەوەی چاوەکانی بتروکێنێ
ەڵێ: «ئەی خۆر!
تۆش شاهید بە
دوێنکەش لە ژووانیان کردین
ە باخەکەی دەم چۆمەکە دەریان کردین،
ەڵام. . «شوانە»!
من «ئەستێ»ی تۆم،
ەبێ بێ ئیمرۆ ئیوارە

تۆڵەی ماچی دوێنێشت بۆبکەمەوە
لەداخی ئەم زۆردارانە
بەدەستی خۆم سووخمەکەت بۆبکەمەوە».
ـ شۆڕەکچە چاوڕەشەکە!
دوێنێ شێت بووم
دوێنێ هار بووم
کە ئێوارە
بە بناری گوندەکەدا گەرامەوە چۆلەکەکان پێیان وتم:
(ئەستێ. . .
لەگەڵ خەڵکەکەی دێ
خزێنرانە پاشکۆی زیلی زۆردارەکان
بە دڵی پڕ گریانەوە. .
بە چاوی پڕ لە ژانەوە. .
بردنیانن بۆ ئۆردووگای ئاوارەکان

ئاوارەکان
ئاوارەکان.)

بە خەمباری ناوم دەبەی
بە خەمباری ماچم دەکەی

# بیروڕاوەرگرتنێکی جیهانی لە بابەت ڕەخنەی ئەدەبی یەوە

عمر محمد اسماعیل
کردوویەتە کوردی

ئەمانە ئەو پرسیارانەن کە گۆڤاری (کێشەکانی ئەدەب)ی سۆڤیەتی لە کۆمەڵێك ئەدیبی جیهانی کردوون ، دەربارەی (پەیوەندی نێوان ئەدیب و ڕەخنەی ئەدەبی) . ئەوا ئێمەش لێرەدا وەڵامی هەندێ لەو ئەدیبانە دەخەینە پێش چاوان کە لەم بیروراوەرگرتنە جیهانی‌یەدا ، لە بابەت ڕەخنەی ئەدەبی‌یەوە ، بەشداری‌یان کردوە .

1 ـ ئایا هاێتان لە ڕێرەوی بزووتنەوەی ڕەخنەی ئەدەبی هەیە ؟ ئەم کارە ڕەخنەییانە چین لە (کتێب ، وتار ، لە سەر نووسین ، گفتوگو . . . ) کە لەم ساڵانەی دواییدا سەرنجی ئێوەیان ڕاکێشاوەو ؟ بۆ چی ؟

2 ـ بە ڕای ئێوە بەشداربوونی ڕەخنەی ئەدەبی لە پەرەپێدانی ئەدەبی هاوچاخی ئەمرۆ لە چیدایە ؟ ئەم دەستاوێژانە چین بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ڕەخنە لە دەوری کۆمەلایەتی‌و ئەدەبیدا ؟

3 ـ پەیوەندی تایبەتیتان لەگەڵ ڕەخنەی ئەدەبی چۆنە ؟ وئایا ڕەخنەی ئەدەبی لە کاری داهێناندا ئاریکاریتان دەکات ؟ ئایا خۆتان جاروبار بە دەوری ڕەخنەگری ئەدەبی هەڵدەستن ؟

## گامارا (فەرەنسا) :ـ

خۆم ڕەخنەگرێکی ئەدەبیم ، پایەیەکی لێپرسراویش لە گۆڤارێکدا دادەگرم کە شوێنێکی سەرەکی بۆ ڕەخنەی ئەدەبی لە نێو لاپەرەکانیدا تەرخان دەکات .

گۆڤـاری (ئـەورویـا) ، ئەو گۆڤـارەی سەربەرزم بەوەی سەرنـووسـەریمـە ، وەنەبێ هەر بە تەنها رەخنە لە ئەدەبی ئەمـرۆی هاوچـەرخـدا بگرێت وبەس بەلکو لێکۆلینەوەی رەخنـەیی لەکـەلـەپـووری رابـردووش دەکات و رەخنە لە بەرهەمی ئەدیبە کلاسیکیەکانیش دەگرێت . ئێمە کاتێك لە داهێنـانی ئەوانـدا دەکۆلینەوە ؛ مەبەستمان تێدا ئەمەیە دووبـارە سەرنجی خۆمـان بگـرینەوە ئەو هەڵسەنگاندنەی لەوانـەوە رەنگی داوەتـەوەو لە رەخنـەی کلاسیکیەوە بۆمان جێ مـاوە . بۆ نموونە ، ئێمە سێ ژمارەی گۆڤارەکەمان لە سەر (مـۆلێر)ەوە دەرچواند ، ئەوەمان تێدا ئاشکراکرد کەوا مۆلێر ئەدیبێکی هاوچاخی ئەمرۆیەو لەگەڵ ئێمەدا دەژیت ، هەر بەمـەوە هەمـوو ئەو بۆچوونـانەمان رەت کردەوە کە دەربـارەی مۆلێـرەوە کرابـوون و لە سەریەکدی کەڵەکەیان کردبـوو ، مۆلێـریـان گۆرستـانێکی خۆڵـەکـەوی ماتی مەزنـەکـانـدا راکشاندبوو . دەتوانم نموونەیەکی دی نوێ وگشتی بهێنمـەوە ئەمیش ئەوەیـە ، بەر لە ماوەیـەکی کەم ژمـارەیـەکی گۆڤـارەکـەمـان تایبـەت بە (تیوفیل گۆتیە)ی ئەدیبەوە دەرکرد . بێ گومان هەموو لایەك گۆتیە دەناسن ، کە ئەدیبێکـەو نوێنـەرێکی دیـاری رێبـازی رۆمانسیەتە ، خاوەنی کەسـایـەتیـەکی دڵکێش و فرەلایـەنگرە ، هەموو لاش ئەوە باس دەکـەن کە وەختی جەنگـان لە پێنـاوی (ئەرنانی)دا ئەم (گۆتیە) یە بەشمەکی رەنگ سووریەوە بە دیـارکـەوت ، هەر وەهـا باسی ئەو گەشتانەشی دەکەن کە گۆتیـە کردوونی بۆ ئەسپـانیـاو بۆ خۆرهەلات . زیاد لەوانە قوتـابیـانی قوتـابخـانـەکان چوار یا پێنج هەڵبەستی گۆتیە دەزانن و ناوی ئەویـان لەو گفتـوگـۆیـانـەوە دیتـەوە بیر کە تایبـەتن بە تیـوری (هـونـەر بۆ هونـەر)ولەچوار چێوەیەش هەمـووشت کۆتـایی دێت . تیـوفیـل گۆتیە لە نێو دەستەی ناودارانـەوە لە ریـزی دووەم یا ئەوەتانی لە ریزی سێیەمەوە دێت ، کە بە زۆری ناوی فیکتۆر هیگۆ ، موسییە ، ڤینی دێـت و لە دوای ئەوانـدا یەکسـەر گۆتیـە بەشمـەکـە سوورەکـانیـەوە پەیـدا دەبێت . ئێمـە هەولی ئەومـان دا روون کردنـەوەیـەك لەم بارەیـەوە بکـەین تاکـو ئەوەمان بۆ ساخ بێتـەوەو بزانین تا چ رادەیـەك ئەم تابلۆیـە لەگـەل راستیـدا دەگـونجێ لە ئەنجـامـدا دیمـان کە گۆتیـە زیاتر لەشتـان نایـابکـارانـە قوول ـ بۆتـەوەو گەلێکی شت بەخشیوەتە ئەدەبی فەرەنسا کەوا زۆر زیاترە لەوەندەی باوەو لەوەوە دەزانـرێت . ئێمـە ئەوە دەزانین کە گۆتیـە دووسـەد بەرگی لە کاری هەمـە چەشنـەی هەلبـەست و کورتـە چیـرۆك و وتـار بلاوکردۆتەوە ، هەروەها کتێبێکی چاکیش لە ژێـر ناوی (مێـژ وی رۆمانسیەت)ەوە داناوە کە ماوەیەك بەر لە ئێستا سۆراخێکی ئەم کتێبە کرا ئەوە ساخ بووەوە کە ئەم کتێبـە ، واتـە (مێـژ وی رۆمـانسیـەت) لە فەرەنسـادا نایێتـەکـرین و بە تەنهـا لە کتێبخـانە گشتی یەکاندا هەیەو چنیگ دەکەوێت .

رەنـگـبـێ من بە شێـوەیـەکـی راستـەوخۆ وەلامی پرسیـارەکەی ئێوە نەدەمەوە ، بەلام لە بەرامبەری هەندێدا بە شێوەیەکی دیار وەلامەکە هەردەخەمەروو ، قسەش لێرە لە دەوری ئەم کێشـەیـە دژ وارەدا دەخولێتەوە کە ئاراستەی بەردەمی رەخنەی ئەدەبی کراوە .

لە فەرەنسیادا ئێستا رەخنەی جۆراوجۆر لە ئارادا هەن و بلاودەبنـەوە ؛ لە رەخنـەی نێـو لاپـەرەی رۆژنـامـە رۆژانـەیـیـەکـانـەو هەفتەییەکانو رەخنەی نێو گۆڤارەکانەوە بگـرە تا دەگـاتـە ئەو کارە رەخنـەییـانەی بە کتێبی تایبەتی دەردەچن و بلاودەکرێنەوە .

سەبـارەت بە رەخنـەی نێورۆژنامە کانەوە دەلێم ئەمانە شێـوەی راپـۆرت دەخـەنەوەبیر ، کە بە رای من ئەم تەرزە رەخنـەیـە چ بیـرۆکـەیەکی گشتی لە بەردا هەڵناوەرێت . دەلێم ئێمـە ئەمـرۆ رەخنـەگری مەزنمان نینەو هەر وەکو لە پێشترێدا نەمانبوون ، کە چی ئەگەر بێت وقسە لەو کارانە بکەین کە بە راستی بە هەند هەلگیراون ، ئەوا دەلێین : ئێمـە رەخنـەمـان هەیـە ؛ کلاسیکی یە . رەخنەمان هەیە رەخنـەیـەکـە بە ناوی رەخنەی نوێ ناودەبردرێ بەلام من وای بۆدەچـم کە لە باتـی ئەوەی بلێیـن رەخنـــەی نوێ چاکتـر وایـە بلێین رەخنـەگـری نوێ ، کە مەبـەستم ئەو رەخنـەگـرانـەیـە کاری هونـەری بە تێـراوانینی نوێ

هەڵـدەسەنگێنن ، شتەکانیش هەرچەند دەکەونە بەرکاری گفتوگۆ بەلام خۆشیشن .

رەخنــەگــرێــك چەمـکـێکی دەربــری بە نێــوی (میکـرۆرەخنـە) . میکرۆ رەخنە بەو رەخنەیە دەگوترێ کە بەرهـەمـەکـە نەك هەر بە تەنهـا دەخاتە ژێر ئەوئاوێنەیەی شت گەورە دەکـات و بەس بەلکـو دەیخاتە ژێر زەرەبینەوە ، ئەمیش بۆ ئەوەی هەمـوو بیـروبابـەتـەکـانی بەرهەمەکە لێ بکۆڵێتەوەو شێوەی دارشتن و شتە وردەکانی شێ بکاتەوە . ئەم چەشنــە رەخنــەیـە ، رەخنـەیـەکی هاوچـەرخـەو رەخنـەیـەکی بە تام و پیـزەو نیشانەی دیاری خۆی هەیە . بەلام من نامـەوێ لێـرەدا باسی لێـوە بکـەم ، چونکە لەم رۆژانە دا گفتوگۆیەکی زۆری لە بابەت دەکرێت .

هەر چۆنێـك بێت رەخنـە لە لای ئێمـە بە شێـوەیـەکی زێــنــدەکــاری بەرێــوە دەروات بەلام لە بارەی کەمـایـەسی یەکانیشیەوە دەلێم کەمایەسی یەکانی لەوەدایە کە لە جیاتی ئەوەی زیاتر یەکلایی لە سەر پەیوەندی نێوان بەرهەمی هونەری و خوێنەردا بکات ، وردە بەرەو رەخنەی ئەزمـونگـەیی و زانکـۆیی ، بەرەو رەخنـەی پرۆفیسـۆری دەچـێـت . من یەك بە خودی خۆم خەون بە داهــاتــنـی رەخنـەیـەکـەوە دەبینم لە جۆرێکی بەرزدا بێت و ژێهاتی ئەوە بێ پردێــك لە نێــوانی بەرهــەمی هونـەری نێـوانی خوێنەردا بنیات بنێت . خۆمن لایەنە چاکەکانی رەخنەی ئەزمونگەیی و رادەی کاریگەری ئەوان رەت ناکەمەوەو نکـولیشیـان لێـوە ناکەم ، بەلام وەك دێتە بەرچاوم بە هیچ تەرزێ ناشێت ئێمـە ئەمـە فەرامۆش بکەین کەوا رەخنەی ئەدەبی لە خزمـەتی بەرهـەمی هونـەری‌دایـەو رەخنەگری راستەقینە مرۆڤێکی داهێنەرە ، چونکە ئەویش بەرهەمێك دادەهێنێت ، بەلام لەگـەڵ ئەو داهێنـانەشیدا دەبێ ئەوەی لە مێـشـکـی خۆی‌دا بنێت کە ئەو ، خزمــەتچی یــەکی بەرهەمە هونەری یەکەو خزمەتچی یەکی خوێنەرە .

بۆ وەلامی پرسیـاری دووەم ؛ کە لە راستیشـدا وەلامم داوەتـەوە ، بەلام دەتـوانم دووبـارە ئەمەی وەگەڵ دەمەوەو گۆڤـارەکـەی خۆمـان بهێنمـەوە ناووەوە . دەبێ بشمبوورن لەوەی هەمیـان لە گۆڤاری (ئەوروپا) دەدوێمەوە بەلام من لەم گۆڤارە بە شێوەیەکی چاکتر شارەزام .

ئەوەم بۆ باس کردن کە ئەم گۆڤارەی ئێمە بە شێوەیەکی نوێ دەروانێتە ئەدەبی کلاسیکی و لە سەری دەکۆڵێتەوە کە ، چی جگە لەمە ئەرکی گرنگی دیکەمان ، هەروەکو تازە باسم کرد ، لەوەشـدایە (ئەمە رای تایبەتی خۆمەو هەندێ برادەریش لەگەڵمدان) ؛ کە یەکلاییەکی تەواو بکرێت لەو پەیوەندی‌یەی لە نێوانی کتێب و لە نێوانی خوێنەردا هەیە ، یان وەکــو دەلێن رێکخستنی ئەوپەیـوەنـدی‌یـەی نێـوانی بەرهــەم هێن و بە کارهێنــە . ئەم بابـەتـە هەنـدێ روون کردنـەوەو دیـاری‌کـردنی گەرەکـە ـ رەخنـەگـر پێویستە لە سەری دەرکی ئەوە بکـات کە خۆی داهێنـەرەو کارەکەشی داهێنانە .

رەخنـەگـر دەبێ ئەوە بزانێ کە ئەو هەرمـەکینەیەك نیەو پوختـەی کاربـداتـە دەست و کتێب رێـك بخات ، دەبێ ئەوەش بزانێ ئەو ، بەو چەشنــە نیــە وەکــو پسپـۆرێکی مێـروناس بێت و پەپوولە ئاسایی کتێبیش بخاتە نێو قووتوو یاخـود بە دەرزیلەیـەکـەوە هەلیبواسێت وکلۆری لێ بدات (لـەگـەڵ ئەوەی هەندێ رەخنەگری واهەن هەر بەم رەنگە رەفتار دەکەن بەلکو دەبێ رەخنەگر زۆر چاك لەوە بگات کە ئەو ، داهێنــەرەو بەرهــەم دەهێنێتـە خولقـان و هەروەهـا ئەوەش تێ بگـات کە خوێنـەری چاك ، ئەویش داهێنـەرە (ئەمەیان زۆر گرنگە) .

ئلیزاتریولیە ، لە قسەیەکیدا (وادێتە خەیالم ئەم قسەیە بیـرکـەی خۆی بێ ، هەرچـەنـد زۆری دیکەش ئەمەیان گوتـوتـەوە) دەلێ :ـ بۆ هەر بەرهەمێك دوو نوسەر هەن ؛ یەکێکیان ئەوەی بەرهەمەکەی داهێناوە ، ئەوی دیکەشیان خوێنەری بەرهەمەکەیە . ئەم قسەیە زۆر راستە .

با (بـەلـەنگـازەکـان)ی فیکتـۆر هیگۆ وەك نموونەیەك وەربگرین ؛ ئەو هەرزەکارەی تەمەنی لە نێوانی پازدەشازدە سالانــدایــە ؛ کە ئەم کتێبـە دەخـوێنێتـەوە بەرۆمـانێکی سەرەرۆیی تێ دەگـات کە پۆلیس راوەدووی پالـەوانەکەی دەنێت و دەیـەوێ بیگـرێ .. کە ئافرەتێك دەیخوێنێتەوە ؛

ئافـرەتـەکـانی وەکـو فینتینـا ، هی ناورۆمـانـەکـە کاری تێ‌دەکـەن و هەڵیـدەرۆژێنن بەڵام سەبارەت بە پیاوەوەیان سەبـارەت بە ئافـرەتـانــەی پەنـجـا شەست ساڵین و تاقی کـردنــەوەیـان لە ژیـانـدا هەیـە ؛ کاتێ ئەم کتێبـە دەخـوێننـەوە ؛ بە لای ئەوانـەوە ئەوا هەموو قسەیەکی ئەم رۆمـانــە لە سەر دادپـەروەریو ئازادیو کۆمــەل و ـ بەنـدیخـانەیە ، بەلای ئەوانەوە ئەم رۆمانە رۆمانی تاوان و سزاو . . . هتـدە هەر یەکێك لە ئێمە کتێبی تایبەتی خۆی هەیەو بە رێگای تایبەتی خۆیەوە هەڵبەست وەردەگرێت ، کە ئەمـانــەش هەمـوو بە تەمـەن و تەنـدروستی و ئاستی رۆشنبیـریـەوە پەیوەندیدارن ، یاخود بە شێوەیەکی گشتی ئەمـە دەربـرین دەلێ‌ین هەر یەك لە ئێمـە داهێنـەری ئەو هەڵبەشانەیە تایبەتن بە خۆیەوە .

بەم جۆرە ، دەبێ رەخنـەگـر ئەمـە لە بەرچـاوی خۆی بگــرێت کە خوێنـەری چاك ئەو کەسـەیـە خوێنـەرێکی داهێنــەر بێت . من لەوباوەڕەدام کە نەنگی رەخنــەگــرە هاوچەرخەکانی فەرەنسا ، لەگەل بەرفراوانیو زانین و ئاگا لە شت بوونیــان ، لەوەدایــە کە ئەوان خواردنێکی حازر دەهێننــە پێش ، خواردنێکی زیــاد لە پێــویست جووداو یاسپی کـراومـان دەدەنێ . رەخنەگری رەسەن و راستەقینە ئەو رەخنـەگـرەیە وامان لێ‌دەکات خۆمان ببینە رەخنەگری داهێنـەر ، رەخنـەگری راستەقینە ئەو کەسەیە ماسی یەك و دووانـم ناداتـێ . . . بەلکـو تۆرێکم دەداتێ تاکـو خۆم بتـوانم راوە ماسی پێ بکـەم وخـۆم خۆراك بە بێ یارمەتی کەسی دیکـەوە دەرخواردی خۆم بدەم من رەچاوی ئەوە لە رەخنـەگـر دەکـەم ؛ خوێنـەری زیخ پەروەر دەیکات وئەم بەرفراونی رۆشنبیری لە شت خەبەرداربوونی ئەم خوێنەرە نەفەوتێنێ .

جاری وا هەیــە چاوم بە هەنـدێ کەسـان دەکـەوێ ، دەبـینـم بە شێــوەیــەکی زۆر چاك سەریــان لە ئیشــان دەردەچـێت و شت دەزانن ، چ شکێکیــان لەم بارەیــەوە لێ نـاکـرێ ، بەلام ئەوزانین وتێگـەیشتنانەیان ئەو هەر لە لای خۆیـان دەمێنێتـەوە کە لە جیـاتی ئەمە من ئەووەیان لێ دەخـوازم ئەوزانیـاریانەی خۆیانم پێ ببەخشن ولێ‌یانەوە فێـربم . جا گرانی‌یـە سەرەکی یەکـە بە تەواوی لێرەدایەو ئەمــەش رێی ئاسـانی فێرکردن نیە . بەلام تا بە گوێرەی رێگاکانی دەرس گوتنەوەش ئەمە بەشتێکی نوێ ونبەرەتی دادەنــرێت . لە فەرەنســادا گەلێ تیـوری نوێ لە بارەی چۆنیـەتی دەرس گوتنـەوە پەیـدابـوونیە کە بە رای من ئەم تیـورانـەش لە بەئـەستـۆ هەلگرتنی پێداویستەکانی رەخنە بەرپرسیارن و لێ‌یانەوە دوور نین .

چەنـد قسـەیــەکــی دی لە بارەی رەخنــەی نێــو رۆژنامەکانەوە دەکەم و ئەمە دووپات دەکەمەوەو دەلێم ئەم تەرزە رەخنەیە تا بلێی رەخنەیەکی لاوازەو زۆر لە شێوەی راپــۆرت یا خود پوختــەی شتــەوە نزیکـە کە بە رای من پوختـەکـردن خراپتـرین شتە . ئایا دەشێ رۆمانی (شەڕو ئاشتی) تۆلستـۆی کورت بکــەینــەوە ؟ ئایــا دەشێ ئەو شتـانـەی ئەم ئەدیبـە بە پێویستی زانیون لە چەند بەرگێدا دەریان ببرێ ئێمە بێ‌ین لە پازدە بیست لاپەڕە یا وەکو زیاتر کۆیان بکەینەوەو لە هەمان کاتدادەست بە مەودایە ئەدەبی وعـاتیفی ومێـژ ویی و کۆمـەلایـەتیـەکانیشەوە بگرین ؟ بە راستی کورت کردنـەوە بە لای منـەوە خاپـانـدنـە . ئێمـە رەچـاوی ئەوە لە رەخنـەگـر ناکـەین بێ ، بابـەتێکمـان بۆ کورت بکـاتـەوە یا راپـۆرتێکمـان پێشکـەش بکات ، رای خۆی تێدا دەربیرێ ، ئەمە چاکەو ئەوە خراپە ، کە لەوانەیە ئەم رەخنـە خۆشیش بێ بەلام ئێمـە ئەوەمـان لێ‌ی دەوێ خوێنەری داهێنەرمان لە بۆ بخولقێنێ .

سەبـارەت بە خۆمـەوە من لە بارێکی تایبـەتیدام . من نووسـەری رۆمانم (رۆمان بۆ گەوران دەنووسم و کتێب بۆ لاوان دادەنێم) ، هەروەهــا رەخنــەگــرێکی ئەدەبیشم و عەیـامێکی دووره وتاری رەخنەیی لە گۆڤاری (ئەورووپا)دا بلاودەکەمەوە ، واتە من لە یەك کاتدا سەر بە دووئۆردوگای جیـاوازدام بە لە هەمـووی دەمەوێ لەوشتەوە بدوێم کە لە رەخنەگر وەکو نووسەرێك چاوەڕێ لێوە دەکەم . من زۆر بە وریــایـی گوێ لەو هەمــوو رەخنــانــەوە دەگــرم کە لە بەرهــەمــەکــانـی منـەوە دەگـرێـن بەلام باوەڕیش بە

هەموویان ناکەم . ئەگەر ئەو شتەی لە سەر کتێبێکی منەوە دەینووسن بە دڵم نەبوو، ئەوا هەڵوێستم لە بەرامبەری ئەمە دا هەڵوێستێکی سروشتی و مرۆڤانە دەبێ ، توورە دەبم و دڵتە نگیش دەبم ، لە دلی خۆمەوە دەڵێم رەخنەگرەکە کەمزانەو چی لێ تێ نەگەیشتووە جاری واش هەیەلە ئەنجامی هزرکردنەوەدا دەگەمە ئەو ئەنجامەی هەتا ئەگەر رەخنەکە رەخنەیەکی تەواو دادپەروەرانەش نەبێ بەڵام لەبەر ئەوەی رووی دەمی کردۆتە شوێنێکی دەستنیشان کراوی بەرهەمەکە مانای ئەوەیە لەم شوێنە دا شتێکی نا دروست هەیە . بەم پێیە لە رێگای بیرکردنەوەدا وا روودەدا هەندێ کەم وکوری دەدۆزمەوە ، لەگەڵ ئەمەشدا مەرج نیە هەمان شت بن کە رەخنەگرەکە پەنجەی بۆ راکێشاون بەڵام من دەگەمە سەر ئەو بروایەی کە بەرهەمەکە لایەنی چرووکی تێدایە .

پەیوەندیم لەگەڵ رەخنەدا پەیوەندی رێزلێگرتنە ، لەو بروایەشدام کەوا رەخنە حەقی هەموو قسەیەکی هەیە ، لە سەر هەرشتێك بیری بۆی دەچێ . هەر مادامەکێ کتێب دەرچوو ئەوا ئەو ئەدیبە لە سەریەتی مل بۆ هەموو رەخنەیەکی ئاشکرا ، کە چ بکات کە لێی دەگیرێ .

من بایەخ بە شێوەیەکی دیکەش دەدەم لە شێوەکانی رەخنە ، ئەویش رەخنەی زارەکی یە . گەلێ جاران وا روودەدات گفتوگۆ لە بابەت بەرهەمەکانمەوە لەگەڵ خەلکێکی زۆر دەکەم ، لە گەورەو گچکەو لاوو هەموو چەشنێك . من زۆر بە دیقەتەوە گوێ لە بیروڕای خوێنەران دەگرم ، تەنانەت ئەگەر شێوەی رەخنەکانیان وەکو رەخنەی رەخنەگرە ئەهلیکارەکان راست و دروستیش نەبێ ئەوا من زەینی خۆمی هەر دەدەمێ . لە سەر ئەو رایەم کە خوێنەری چاك رەخنەگری چاکە ، هەر لەبەر ئەم هۆیەشە حەزدەکەم خوێنەرەکان داهێنەر بن چونکە خوێنەری داهێنەر رەخنەی چاکمان بۆ دەهێنێتەکایەوە . خوێنەری داهێنەریش ئەو خوێنەرەیە خوێندنەوەی میکانیکی ناکات و پەلەی نیە لە پەرهەڵدانەوەی کتێبەکەو زوولێبوونەوەی بەلکو لە دەقەکە ورد دەبێتەوەو لە لایەنی جوانی کاری و لایەنی لاوازی لە کتێبەکەدا دەگەرێ کە هەبێ . جا ئەم خوێنەرە بەرهەمێکی نوێ لە سەر رێگای تایبەتی خوێ دەخولقێنێ ورەخنەی ئەویش هەردەم بە تام دەبێ .

لە کۆتاییشدا رێگام بدەن لەو رەخنەیە بدوێم کە لە لای ئێمە ، لە فەرەنسا ، قەت باسی لێوە ناکەن ، مەبەستیشم لەم رەخنەیە رەخنەی زارۆکانەو کە من زۆر جاران لە گەلیانا کۆدەبمەوە . جێگای داخیشە رۆژنامەگەری فەرەنسا کاتێ دەست دەداتە کتێبی تازە پێگەیشتووان ؛ جێگەیەکی زۆر کەم بۆ رای تازە پێگەیشتووەکان ، خۆیان تەرخان دەکات . من بە پێی تافی کردنەوەی تایبەتی خۆمەوە دەتوانم بڵێم ئەو پێگەیشتنانەم لەگەل ئەم تازە خوێنەرانە کەڵکی زۆریان پێ بەخشیوم .

زارۆك گەلێ پرسیاری جۆراو جۆر دەکەن ، لە هەمووشیان خۆشتر ئەوەیە کە لە پیشەی نووسەر دەپرسن . کەسێکی دی قسە لەو زروفانە ناکات کە نووسەری تێدا دەژیت و ئەدەبی پێدا دەروات ، کە چی زارۆك بە شێوەیەکی راستەوخۆ دەپرسن :- چەندی پارە قازانج دەکەی ؟ چەندت وەرگرتووە ؟ لە راستیشدا ئەم مەسەلە ئابووریانە سەرنج تێروانینیان گەرەکە چونکە مەسەلەی گرنگن . من ئاسایی لەم حالە تانەدا وەلام دەدەمەوە کەوا کۆمەلێکی یەکجار بچووك لە ئەدیبەکان لە فەرەنسادا بە قەلەمی خۆیان دەژین . ئەم تازە خوێنەرانە هەروەها دەپرسن :- ماوەی چەند خەریکی نووسینی ئەم رۆمانەو ئەو هەلبەستە بووی ؟ کاتێکیش وەلامیان دەدەمەوە ؛ جن لە بەرهەمەکانی خۆم تێدەفکرم ئەو ساوەلام دەدەمەوە . مندال بایەخ بە نهێنەکانی بەرهەمی هونەری دەدەن ، لە پیلانی کتێب دەپرسن و رادەی گونجانی لەگەڵ رووداودا لێك دەدەنەوە . مندال بە سادەیی حەز لە شتی رووداوەکەن و پرسیاری لەم چەشنەش دەکەن : ئایا تۆ لەوێ بوویت ؟ ئایا خۆت بە چاوی خۆت دیوتە ؟ ئەم پیاوەتان ئەو ئافرەتە دەناسیت ؟ من هەموو ئەو پرسیارانە

وەلام دەدەمەوە چونکە ئەم پرسیارانە پەیوەندی‌یان بە بنچینەکانی کاری ئەدیبەوە هەیە ، واتە چۆن رووداوو سروشتی رووداو بکەینە بەرهەمی هونەری ، ئەمەش شتێکی زۆر گرنگە .

پرسیارێکی دیکەی گرنگ هەیە ئەویش هەر تازە پێگەیشتووەکان دەیکەن کە دەڵێن ، سەرچاوەی کتێب لە چیەوەیە ؟ خۆوەلامی دوورو درێژ ی ئەم پرسیارە فرەکات دەخایەنێ . بەلام من وەلامەکەیان بە کورتی پێ دەلێم .

خوێنەرە تازەکان مەراقیان لەوەدایە کە دەستنووسێکی ئامادە بۆ چاپ بۆ کوێ دەچێت وچی لێ دێت ؟ چونکە کتێب بەر لەوەی بکەوێتە بەر دەستی خوێنەرانەوە بە ئامێرو دەزگاکانی بلاوکردنەوەدا تێپەر دەبێت وئەوانیش بۆ کۆگاکانی کتێبی دەنێرن ، بەداخەوە ئەم قۆناخە گرنگەی زروفی ئێمە تەنها تازە پێگەیشتووەکان بایەخی پێ دەدەن کە چی ئەگەر گەورەکانیش بایەخی پێ بدەن چ نا بەجێ‌ییەك روونادات .

کێشەی بلاو بوونەوەی کتێب کێشەیەکی لەبەر چاوان دیارەو شێوەیەکی دژ واری هەیە . ئەگەر ئێوارە بەرنامەی تەلەفزیۆنی بە رۆمانێکدا هەڵبلێت ئەوا خوێنەر لە رۆژ ی داهاتوودا بە هەڵەداوان خۆی دەگەیەنێتە کتێبخانەو ئەو کتێبە دەکرێ . خۆ ئەگەر نەیتوانی ئەوا کتێبە ناخوێنێتەوە بێ گومان چارەنووسی مادی وئابووری کتێب بەندە بەرەخنەگرەوە . هەر بەم شێوەیە دەشێ ئەم کتێبە بگاتە دەستی خوێنەران یاخود نەگات . گەرەکە ئەم هەموو کارانە ئەوەندە سادە سەیر نەکرێن و قسەکانی منیش بە راستی‌یەکی رووت لە قەلەم نەدرێن و نەکەونە بەر گفتوگۆیان بەلام دەبێ ئەوە بزانن کە ئەم جۆرە کێشانە لە ولاتی سەرمایەداریدا هەن وکاریش دەکەنە سەر بیرو باوەڕە تیوری‌کانمان

**سیلا (ئەسپانیا) :**

1 ـ هەموو جار لەوەوە دەست پێ ناکەین ! کە جیاکاریەك بە پێویست دابنێ‌ین لە نێوانی رەخنەی زانستی و زانکۆیی لە لایەکەوەو نێوانی رەخنەی جەماوەری لە لایەکی دیکەوە . رەخنەی جەماوەری ئەو رەخنەیە کە لە سەر لاپەرەی رۆژنامەو گۆڤارەکاندا بلاودەکرێتەوە . چەشنە رەخنەیەکە ؛ بایەخێکی تایبەتی بە خۆیەوە ناگرێت وبەشیوەیەکی جەوهەری کار ناکاتە سەر ژ یانی رۆشنبیری وسەرنجێکی تایبەتی راناکێشێت . بێ گومان هەندێ وتاری رەخنەیی لەمەوە دەردەهاوێژ رێ ئەویش وەکو ئەو وتارانەی لە (لۆمۆند)ی فەرەنسی یا لە پاشکۆیە ئەدەبی‌یەکەی (تایمز)ی لەندەنی بلاودەکرێنەوە .

دەستنیشان کردنی کتێب یا وتار ئەو لە سەر نووسینانەی لەم سالانەی دواییدا سەرنجیان راکێشاوم ئەوا بە لای من کێشەیەکی ئالۆزە بەلام لە ئەدەبی ئەسپانی وئەدەبی ئەسپانی ـ ئەمەریکی‌یەوە روودەدەن ، واتە لەو جیهانەی خۆم تێیدا دەژ یم .

2 ـ بە رای من ئەم برە بەشداری‌کردنە بە چاکی دیارەو ئەوەندە زۆر نیە چونکە کاری داهێنانی ئەدەبێ بە بێ رەخنەش هەر مەیسەر دەبێت لە بەر ئەوەی رەخنە ئەو وختە سەر هەڵدەدات کە بەرهەمەکە بلاوبۆتەوە .

بە رای من تاقە رێگا بۆ پەرەپێدانی رەخنەی کۆمەلایەتی و پیشەیی ؛ ئەوا پەرەپێدانە .

بە کردەوەی بە هەند هەڵگرتنی رەخنەو بە هەند هەڵگرتنی رەخنەو بە هەند هەڵگرتنی مەوزوعیەتی رەخنەو بەرپرسیاری ئەو . بە بێ ئەم چۆنیەتیە ئەوا رەخنە بە کەلکی بە کارهێنان نایەت .

3 ـ رەخنەی ئەدەبی لە کاری داهێنانی مندا هیچ یاریدەیەکم نادات چونکە پەیوەندی نێوان بەرهەمی هونەری ونێوانی رەخنە ، هەروەکو پێشتر ئەمەم نیشان کرد ، ئەوەیە کە رەخنە دەست دەداتە بەرهەمێکی هونەری دوای دەچوونی ئەم بەرهەمە . ئەدەب بۆی نالوێ لەگەل ئارەزووەکانی رەخنەدا بروات و هەر بەرهەمێکیش زادەی

ئەم چەشنە یەکبوونە بۆ ئەوا بەرهەمێکی دەستکرد دەردەچێت یا ئەوەتانی بە مردوویی لە دایك دەبێت .

کەم جار بەدەوری رەخنەگری ئەدەبی هەڵدەستم ، هەرچەندیش لەم بوارەدا هەندێ کارم بە نووسین گەیاندوون بابەتی ئەووتارەم وەختێ چوومە ئەکادیمیەوە لە سەر داهێنانی ئەدەبی بوو لە لایەن هونەرمەند سولانا ـ هەروەها لە سەر هەندێ رۆمانی سەدەی شازدەمین وحەڤدەمینم نووسیون .

## ماکۆفیسکۆ (رۆمانیا) :

1 ـ من لەو بروایەدام کە دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (کێشەکانی ئەدەب) شایانی ئەوەن منەتباریان بم بەوەی بانگهێشتی ئەوەیان کردم بەشداری ئەم رادەربرینەبم ، دیسانیش لەو بروایەدام کە خوێنەرەکان دەمبەخشن لەوەی لیستەیەکی درێژ بە ناوی ئەو ئەدیبانەو ئەو بەرهەمانەوە ناو دەبەم کە لەم سالانەی دواییدا دەرچوون و پەیوەندییان بە رەخنەوە هەیەو سەرنجێکی تایبەتیان لە لای مندا . جێ هێشتوە ، کەواش دەکەم ، بە ئەنقەستە ، لەبەر ئەوەی من خۆم ، هەموودەمێ ، لەوە بە دوور دەگرم بەرهەمی ئەدەبی هەڵبسەنگێنم و ئەرکی سەر ئەستۆی شاعیرو ئەدیب و رەخنەگرەکان دەستنیشان بکەم .

من هەردەم لە سۆسەی هەموو ئەو شتانەم کە لە بواری رەخنەی ئەدەبیدا بلاودەکرێنەوە ، بە خۆشییەوەش کتێب وتارو لێکۆڵینەوەکان دەخوێنمەوە کە هەموو ئەمانە بە رای من زیندەگی دەکەنە بەرژ یانی ئەدەبی و پەرەسەندنی مسوگەرتر دەکەن . زۆر بایەخ بەو رەخنە ئەدەبییە دەدەم کە رووەو بیری نوێیەو لێکۆڵینەوەی تازە بابەت دەکات و شتی نوێ دەدۆزێتەوە مرۆڤ بۆئەوە رووی خۆی دەداتە رەخنەی ئەدەبی لەبەر ئەوەیتی ئەو بە دوای شتێکی ئەوتۆدا دەگەرێ هاریکاری ئەوەی بکات بەرهەمی دروستتر بنووسێ بەلام قەتێش لەوبروایەدا نیم ؛ رەخنە بتوانێ دەوری ئەدەبی هونەری ببینێ یا بتوانێ بە هەچ شێوەیەك بێ شوێنی ئەو بگرێتەوە . لە راستیشدا هەر نووسەرێك خۆی رەخنەگری ئەدەبی بەرهەمە هونەریەکانی خۆیەتی .

2 ـ وەلامی پرسیاری یەکەمم هەرگیز ئەوە ناگەیەنێ کەوا رەخنەی ئەدەبی بەشداری کاری داهێنان ناکات , بەڵکو ئەو وەلامم تەنها لایەنێکی ئەو پەیوەندییانە دیاری دەکات کە لە نێوانی ئەدەب و رەخنەدا دروست بووە . بەلآم لایەنی دیکەی ئەو پەیوەندیانە لەو کاریگەرییەدایە کە رەخنەی ئەدەبی لە سەر کاری داهێناندا دەری‌دەخات ، (پێویستیشە دەری بخات) .

یەکالاکردنەوەی بەرهەمی هونەری و بایەخ هەڵسەنگاندنی ئەو بەرهەمەو روون کردنەوەی تێدا سەرکەوتن و سەرنەکەوتنی نووسەرەکە ؛ هەموو دەکەونە بەر ئەرکەکانی سەر ئەستۆی رەخنەو رەخنەگری ئەدەبی . کە جگەلەمانەش ئەرکی دیکەی لەوەدایە لەو رێبازە ئەدەبی یە نوێیانە بتوژێتەوە کە لە بواری ئەدەبدا سەر هەڵدەدەن . رەخنەگر ئەم رێبازە نوێیانە بە جوانی روون دەکاتەوەو ئازایەنە لە سەر هەموو شتێکی نوێی تازە دیارو تازەپەیدا بوو وەدەنگ دێ کە هەندێ جار لەگەل خەباتی خۆی لە دژ ی لایەنە کۆنەکانا دەکەوێتە نێو خەباتێکی راستەقینە لە پێناوی پەرەسەندنی داهاتووی ئەدەبدا .

هەندێك بیروراهەن دەڵێن :ـ ئەدەب بە بێ رەخنەش لە پەرەسەندنی خۆی هەر ناکەوێت ، لەهەمانکاتیشدا بیرورای پێچەوانەی ئەمەش هەیە کە دەلێ چ ئەدەبێك بە بێ رەخنەی نابێت . ئەم رایانەش هەمووزیاد بۆچوونی تێدایە ، هەمووزیاد بۆچوونی دیکە ئاسا لە سەر بناغەی راست دانەرێژراون ؛ سەرەنجامیش هەر راست دەرناچن .

لە جیهانی ئەمرۆماندا ، ئەو جیهانەی خەباتی ئایدیۆلۆژ ی تیا زیاتر لە پێشان تیرترو ئالۆزتر بووەو لێکۆلینەوەی بە دوای شتی نوێ و دەربرینی نوێ تێدا بەردەوامە ، رەخنەی ئەدەبی بۆتە شتێکی پێویست ، ئەویش چەشنە رەخنەیەك لە سەر هیمی زانست

وداهێنــانــدا خوێ بوەستێنێ ، رەخنــەیــەك بێ پشتی نووســەربگــرێت و بەرەو رێگــای سیــاسی و ئایــدیۆلۆژ ی و جوانیكــاری رێنمــایی بكــات ، چەشنــە رەخنــەیــەك بێ هەروەك (مــن)ەكـــەی دووەمــی نەوســـەر خۆی بێــت كە نووسەریش پێویستە خوێو دەنگ ـانەوەی خۆی تێدا ببێنێتەوە .

بێ گومــان ، گەرەكــە هەمــوولا بیــر لەوە بكــەینەوەو لە پێنــاوی ئەوەدا كار بكــەین كە رەخنــەی ئەدەبی بە دیقــەتتر بێت و پتر خۆ بە لایەن بگرێت ، بۆیشمان هەیە پەنجە بۆ ناوی ئەو رەخنــەگــرە مەزنــانــە یا ئەو رێبــازە رەخنــەییــانــە رابكــێشین كە لە ماوەی جیــا جیــای سەرهــەڵــدانی و پەرەســەنــدنی هەمــوو ئەدەبێكــدا رێگای نوێ نوێیان لە بەردەمی ئەدەبدا كردۆتەوە .

3 ـ هەمیشــە هەولی ئەوە دەدەم پەیوەندیم لەگەل رەخنەی ئەدەبی و لەگــەل رەخنــەگــرانــدا زۆر سروشتی بێت ، هەر كاتێكیش وتــاری رەخنــەیی لە سەر كتێبی من دەردەچێ ؛ زۆر بە وردی و زۆر بە هەوەسەوە ئەم وتارە دەخوێنمەوە هیچ شكیش ناكەم كە پێویستی ئەوە بكات كەیف خۆشی خۆم بشــارمــەوە كاتێ رەخنەگرەمان بە چاكە لەو شتەوە دەدوێن كە لە منـــەوە نزیكـــەو سەنگی لە لای من هەیــە ، بەڵام دڵتــەنگیش دەبم كاتێ بە خراپە لە سەر شتێك دەدوێن كە لە لای خۆمــەوە ئازیزبێ ؛ دەگەرێمەوە دووبارەو سێ بارە ئەو رەخنــەیــە دەخــوێنمــەوە تا ئەو شتــە پێــویستــانــەی لێ هەلبهێنجم لەنوسینی دواترێمداكەلكم وێ دەبەخشن .

هەمـــودەم هەولی ئەوە دەدەم ئەو تێبینیـــانــە تێ بگــەم كە رەخنـــەیـــان پێ لە من گیـــراوە . بەڵام قەتیش ئەمـــە وا ناگــەیــەنێ كە من لەگەڵ هەموویاندا رێك دەكەوم چونكە هەڵەیە نووسەر بۆ هەموو تێبینیەكی رەخنەیی بسەلمێنێ كە بەمە پەیوەندی نێوانی ئەوو (واتە نووسەرەكە) نێوانی رەخنە دەبێتە پەیوەندی یەكی بە شێوە پەیوەندیوبەس .

پێشتــر بەشــداریم لە كاری رەخنــەی ئەدەبی كردوە ، ئێستــەش دەیكــەم بەڵام كەمتــر . لەبــەر ئەوەی من وتاری رەخنــەییم نووسیون و لێكۆلینەوەم لەم بارەوەكردوە ؛ چاك دەزانم خەلــك بە چ چاوێــك دەرواننــە رەخنــەگران ، جا لەبــەر ئەوە قەتم بەخیلی پێنەبردوون و ئێستاكەش پێیان نابــەم هەنــدێــك جار خەللك ئەوەندە تۆمەتیان دەخەنە پاڵ گەلــەك زیــاتر لەوەی ئەوان پێیانەوە تاوانبارن ، هەندێك جاریش دەیــانــخــەنــە ئاستــێكی ئەوتۆی هەست بە لێپــرسینــەوە كردن گەلــەك زیاتر لەوەی خۆیان هەستی پێ دەكەن ، بەلكو جاری وایە قسەی ئەوتۆ دەبیسین كە دەلێ ئەم رێبــازە ئەدەبی یــەیــا ئەو نووســەرە نسكــۆی هێناوەو لە ئەدەب كەوتـــووە ئەویش لەبــەر ئەو هێــرشــانــەی بووە كە رەخنەی ئەدەبی كردوونیەتە سەری .

پەیــوەنــدی‌یەكی دۆستایەتی سروشتی گەلەك پێویستە بنیــات بنــرێ لە نێــوانی ئەو كەســانــەی بەرهەمی ئەدەبی دادەهێنن و لە نێــوانی ئەو كەســانــەی لەسەر ئەو بەرهەمە دەنــووسن . هەر ئەو پەیوەندی و هاریكاریەشەكە دەبێ باو بێ لە نێــوانی نووســەرو رەخنــەگــرد چونكە هەر یەكێكیان شوێنی تایبــەتی خۆی پر دەكــاتەوەو لە بواری تین وزانایی خۆیدا یاریدەی سەرهەڵدانی بەرهەمی هونەری دەدات و هەروەهـــا یاریـــدەی پەرەســـەنـــدنی بەرهـــەم دەدات . هەرتێكچـــوونێكی نێـــوان ئەدەب و رەخنــەش بەشتێكی نائــاسایی لە قەلەم دەدرێت و مەترسی خراپی لێ دەكرێت

ئەدەب پێـویستی بە خولقــانی بەهــای بەرزو هونــەری نوێ هەیــە ، رەخنـــەی ئەدەبیش كارێكی پێـــویستـــە بۆ داهێنانی بەرهەم .

---

ـ ئەم بابەتەم لە گۆڤاری ( الثقافه الاجنبیه) ، ژمارە 3ی سالی سێیەم ، 1983 وەرگرتووەو كردوومەتە كوردی .



# ئولدوز و قەلە رەشەکان

**گوشاد حمەسعید**

**لەفارسیەوە**

بۆئاگاداری لە جیاتی وشەی (ننەکلاغە) پور قەلەرەشم بەکارهێناو لەجیاتی (ددەکلاغە) مام قەلەرەش چونکە کوردکە بانگی یەکێك بکا زیاتر لە پورێ یان مامە یان خاڵە نەك دایەوبابە بۆیە ئەم تێبینیەم بە پێویست زانی. هەروەها لە زۆر شوێنیش ووشەی (بابە) لە جیاتی بانگ کردنی باوەژن ئەمەش لەکوردەواری دا شتێکی باوە.

## چەند قسەیەك لەبارەی «ئولدوز»ەوە

منداڵان، ئەم کاتەتان باش! ناوی من ئولدوزەومناکەیشی (ئەستێرە)یە، ئەمساڵ سەری دەساڵە لەتەمەنمدا تێپەری. ئەم چیرۆکەی کە دەیخوێنیتەوە بەشێکە لە بەسەرهاتی ژیانم وەختێ مامە بەهرەنگ مامۆستای دێیەکەمان بوو. لە ماڵی ئێمەدا بوو. رۆژێکیان من بەسەرهاتی خۆمم بوگێرایەوە، مامە بەهرەنگ زۆری پێخۆش بوو وتی: ئەگەر رێگام بدەی، بەسەرهاتی تۆو قەلەرەشەکان دەکەمە چیرۆك و لە کتێبێك دا دەینووسمەوە. من رام لێ بوو بەڵام بەچەند مەرجێك: ـ

یەکەمیان ئەوەبوو کە چیرۆکەکەم تایبەت بۆمنداڵان بنوسێتەوە، چونکە پیاو حەواسیان ئەوەندە پەرتەکە نە لە چیرۆکەکەم دەگەن و نە چێژی لێوەردەگرن. دوەمین مەرجیش ئەوەیە کە چیرۆکەکەم بۆئەم منداڵانە بنووسێ کە یان هەژاربن ویان زۆر بەناز بەخێو نەکرابن هەروەها ئەم منداڵانەی لەخوارەوە ناویان دەبەین مافی خوێندنەوەی چیرۆکەکانی منیان نیە:

1 ـ ئەومنداڵانەی کە لەگەڵ نۆکەرەکانیان دێنە قوتابخانە 2 ـ ئەو منداڵانەی کە بەسواری ئۆتۆبێلی گران بەها بۆقوتابخانە دێن. مامە «بەهرەنگ» دەی وت کە لە شارە گەورەکاندا منداڵی دەوڵەمەندەکان بەم جۆرە دەفتار رەکەن و زۆریش بەخۆیان دەنازن.

ئەمەیشیان بڵێم کەوا من تا تەمەنی حەوساڵیم لەلای باوەژنم «زردایکم» بووم. ئەم چیرۆکەش هەرهی ئەو سەردەمانەیە دایکی خۆم لە لادێ بوو. باوکم ئەوی تەلاق دابوو، ناردبویەوە لای دایکی لە لادێ و ژنێکی دیکەی هێنابوو. باوکم لە دایەرەیەکدا ئیشی دەکرد. لەو وەختانەدا ئێمە لەشاردا دەژیاین. ئەوێ شارێکی بچوك بوو. تەنیا شەقامێکی هەبوو. پاش چەندساڵێك منیش بۆگوند چووم.

بەهەرحاڵ، مامە بەهرەنگ پەیمانی داوە کە پاش ئەمە. چیرۆکی بوکەشوشە کەورەکەشی بنوسێ. ئومێدەوارم کە ئێوە زۆرشت لەبەسەرهاتی منەوە فێربن.

خۆشەویستتان ـ ئولدوز



## ● ئولدوزو قەلەرەشەکان

ئولدوز لە ژوورەوە دانیشتبو. تاك و تەنیابوو. سەیری دەرەوەی دەکرد. باوەژنی بۆحەمام چووبوو. دەرگای رەپێش کردبوو. بە ئولدوزی وتبوو لەجێگای خۆی نەجوولێ. نەخۆ ئەگەر بێتەوە سەری لەگۆری باوکی رادەکا. ئولدوز لە ژوورەوە دانیشتبو، بیری دەکردەوە، سەیری ئەم لاوئەولای دەکرد. وەکو مرۆڤی گەورە لە بیرکردنەوە بوو. نەدەجولا زۆر لە باوەژنی دەترسا. لەبیری بوکەشوشە گەورەکەشی دابوو. بوکەشوشەکەی بەنوێیەتی ون کردبوو. دڵی ئەوەندە تەنگ بوو هەرباسی تاکرێ. چەندجاران پەنجەکانی ژمارد. دوایی لەسەرەخۆ هاتە رۆخ پەنجەرە. حەوسەلەی نەمابوو. لەنکاوێکدا بینی قەلەرەشتێك لەرۆخ حەوزەوە نیشتووە، ئاو دەخواتەوە. **هاودەنگیەگی بۆپەیدابوو** تەنهایی یەکەی فەرامۆش کرد. دڵی کرایەوە. قەلەرەشەکە سەری بلندکرد. چاوی بەئولدوز کەوت. ویستی هەڵ فرێ، کەبینی ئولدوز هەقی بەسەریەوە نیە، نەفری. تۆزێك دەنوکی کردەوە ئولدوز وایزانی قەلەکە دەیەوێ پێکەنێ. شادمان بوو.

پێیوت: ـ مام قەلەرەش، ئاوی حەوزپیسە، ئهگە بیخۆیتەوە نەخۆش دەکەوی.

قەلەرەشەکە دووبارە پێکەنی. پاشدان باڵەفرکەیەکی کردو هاتە پێشەوە، وتی: ـ نا، جانم بۆئێمە خراپ نیە، لەمە پیس تریش دەخۆینەوەو هیچیش نابێ. پێشم مەڵێ (مامە قەلەرەش)، من مێیەم و چوار بەچکەشم هەیە ـ پێم بڵێ (پور قەلەرەش)0.

ئولدوز تێنەگەیشت چۆن قەلە ژنە. ئەوەش میهرەبان بوو کە ئولدوز دەیوویست بیگرێ و ماچی بکا، راستە.. قەلەکە جوان نەبوو بەڵکە ناشرنییش بوو، بەڵام دڵێکی پر لەسۆزو خۆشەویستی هەبوو. ئەگەر هەرکەمێکیش هاتبایە پێشەوە دەیگرت و ماچی دەکرد.

پورە قەلەرەش ئەمجارەش دیسان هاتەپێشەوەو وتی: ـ

تۆ ناوت چییە؟

ئولاوز ناوی خۆی پێوت. پاشدان پورە قەلەرەش پرسی: ـ

لەو زورەدا چی دەکەی؟

ئولدوز وتی: هیچ ناکەم. باوەژنم لێرەی بەجێ هێشتووم و بۆ حەمام چووە. پێی ووتم لەشوێنی خۆم نەجولێم.

پورە قەلەدەش وتی: ـ تۆوەك مرۆڤی گەورە بیر لە هەمووشتێك دەکەیتەوە. بۆچی بۆخۆت یاری ناکەی؟

ئولدوز بوکەشوشە گەورەکەی بەبیرهاتەوە، ئاخێکی هەڵکێشا. پاشدان پەنجەرەکەی کردەوە تا دەنگی بچێتەدەرەوەو ووتی: ـ ئاخر پورقەلەرەش، هیچم نیە یاری پێبکەم. بووکەشوشەیەکی گەورەم هەبوو ون بوو. بووکەشوشەکەی قسەی دەکرد.

پورە قەلەرەش فرمێسکی چاوەکانی بەسەری پەڕی باڵەکانی سریەوە باڵەفرکەیەکی لێداو لەرۆخ پەنجەرەکە وەنیشتەوە. یەکەمجار ئولدوز ترساو لێی کشایەوە. پاشدان ئەوەندە شادمان بوو هەرپێناسی ناکرێ لێی هاتەپێش. پورە قەلەرەش وتی: ـ

هاورێ و دەستەبراشت نیە یاریت لەگەڵدا بکا؟

ئولدوز وتی: ـ هاورێیەکم هەیە ناوی «یاشار»ە، بەڵام دیسانەوە ئەویش هە زۆر کەم دەبینم. دەچێتە قوتابخانە.

پورە قەلەرەش وتی: ـ وەرە با بەیەکەوە یاری بکەین. ئولدوز

قەلـەرەشـەکـەی گرت و لەبـاوەشی گرت . سەری مـاچ کرد . رووی ماچ کرد . پەرەکـانی زبـربـوون . قەلـەرەشـەکـە قاچەکانی لەژێرخۆیەوە گرتبوو تاوەکو جلەکانی ئولدوز پیس نەبێت . ئولدوز دەنوکیشی ماچ کرد . دەنوکی بۆنی سابونی لێدەهات .

وتی : ـ پورقەلەرەش ، تۆ زۆر حەز لە سابون دەکەی؟

پور قەلەرەش وتی : ـ من بۆ سابون دەمرم هێندەم حەزلێیەتی !

ئولدوز وتی : ـ باوەژنم تورە دەبێ . دەنا سابونێکم بۆدەهێنای و دەتخوارد .

قەلەرەش وتی : ـ بەدزیەوە بی هێنە . باوەژنت بۆن ناکا .

ئولدوز وتی : ـ ئەدی تۆ ناچی پێی بلێیی ؟

قەلەرەش وتی : ـ من؟ من شکایەت لەکەس ناکەم .

ئولدوز وتی : ـ ئاخر باوەژنم دەڵێ : «تۆ هەرچی یەك بکەی ، قەلەرەش دێت ویێم دەڵێ» .

پورە قەل لەدڵـەوە پێکـەنی و وتی : ـ درۆدەکـا جانم بەسـەری خۆم بەو سەرە رەشەم من شکات لە هیچ کەسێك ناکەم لە فێلی ئاوخواردنەوە دێمە دەم حەوزەوەو ماسی و سابون دەدزم و بۆی دەردەچم .

ئولدوز وتی : ـ پورە قەلەرەش ، دزی‌کردن بۆچی؟ گوناحە .

پورە قەلـەرەش وتی : ـ خۆت منـداڵ مەکـە جانم . گونـاهی چی‌یـە؟ ئەوەگـونـاهە کەوا دزی نەکەم ، خۆم و ماڵ و منداڵم لەبرسان بمرین ئەدی ئەمـە گونـاحـە . ئەمـە گونـاحـە کە نەتـوانم خۆم تێربکەم ئەمە گوناحە کە سابـون لەژێـر پێیـان فرێ دریێ و منیش بەبـرسی‌یـەتی بمێنمەوە من بابی ئەوەنـدە ژ یـاوم کە ئەم شتـانە بزانم . تۆش ئەمە بنرانەکە بەم ئامۆژگاری‌یە پروپـوچ وشکـانـە ناتـوانرێ بەری‌دزی بگیرێ . تا ئەوکاتە هەرکەسە بۆ خۆی ئیش بکـا دزیش هەردەمێنێ . ئولـدوز ویستی بچێت قالبێك سابون بۆ قەلـەرەش بێـنـێ . باوەژنـی خواردنـی لەنـاو هێـلەگـدان دەنـاو هێلەگ دانـەکـەیشی دادەخست و کلیلی دەدا . بەڵام سابـونـەکـانی هەڵنەدەگـرت . پور قەلـەرەشی لەنـاو پەنجـەرەوە بەجێ هێشت خۆیشی چووە ناو ژ ورە بچوکەکەی ئەولاوە قالبە سابونێکی رەقی دەست دایەو هێنای .

منـداڵان چاوتـان خراپ رۆژنـەبینی ! ئولـدوز بینی کەوا قەلـەرەش هەڵفـری‌وەو باوەژنیشی خەریکـە بەرەوپەنجەرەدێ . بوخچەی حەمامی لە بن هەنگل بوو . دەم وچاوی وەك چەوەندەر سورهەڵگەرابوو .

ئولدوز خراپ توش هاتبوو . باوەژ ن سەری لە پەنجەرەوە بەژ وورەکەدا خوارکـردەوە ، بەسـەر ئولـدوز داقیـژ انـدی : ـ ئولـدوز دیسـان چی بـووە ماڵەکەت بەسەریەکدا پرژاندووە؟ مەگەر پێم نەوتبووی مەجولێ ، ها؟

ئولـدوز هیچی نەوت : ـ باوەژ ن چوو قوفلی دەرگـاکـە بکـاتـەوەو بێتە ژ وورەوە . ئولـدوز بەخێـرایی سابـونـەکـەی لەژ یـر کراسـەکـەی شاردەوە باوەزن هاتە ژ وورەوەو وتی : ـ پێم ناڵی بەدوای چیدا دەگەرای؟

ئولـدوز لەسـەرخـۆوتی : ـ یایـە . . لێم مەدە! خەریـك بووم بەدوای بوکەشەکەمدا دەگەرام .

باوەژ ن زۆری‌رق لە بوکەشوشەکەی ئولدوز دەبۆوە . گوێی ئولدوزی گرت و بای‌دا . وتی : ـ سەد جارم پێ وتـوویی خەیـاڵی بوکـەشـوشـە بە دوومەکەت لەسەرت دەرکە! تێدەگەی؟

پاش ئەوە ، با وەژ ن چووە موبەق چایەك بۆخۆی لێ‌نێ .

ئولـدوز بە فێلی گەران چووە حەوشـەوە . سەیـری ئەم بەرو ئەوبـەری کرد . دیتی قەلـەرەش لەسـەر ستـارەی بانـدا هەڵنیشتـووە ، چاوەکـانی فیگـەرانـە . سابـونـەکـەی برد لەبن گل و دارەکانی دانا ، چاوێکی لە پور قەلـەرەش داگـرت نابێ سابـونـەکە ببات . پورە قەلەرەش زۆر لەسەرەخۆ هاتـە خوارەوەو چوو لەنـاو دارەکـان خۆی حەشـاردا ئولـدوزلێی پرسی پورەقەلەرەش . بەچکەیەکت دەهێنی یاریم لەگەڵدا بکات؟

قەلـەرەشەکە بەقرەقریکەوە وتی : ـ پاش نانی نیوەروٚ چاوەرێم بە ئەگەر مێردەکەشم رازی بێ ، بەچکەیەکت بۆ دەهێنم .

ئەووەختە سابونەکەی هەڵگرت و ، لە شەقەی باڵی داو فری .

ئولـدوز چاوی لە ئاسمـان بریبـوو ، کاتێ قەلـەرەش دورکـەوتـەوە ، لەخـۆشیـا دەستی بەهـەڵپـەرین کرد . وەك ئەوەی بوکـەشـوشـەکـەی دۆزی‌بێتـەوە . لەنـاکـاو باوەژنی بەسەریدا قیژ اندی : کچێ ، ئەوە بۆچی سەمادەکەی؟ وەرەژ وورەوە . گەر مالێت دەدا . من هێزم نیە خزمەتت بکەم .

وەختـی فراویـن خواردن بوو . ئولـدوز چوو لەژ ورەوە دانیـشـت . پاش چەنـد دەقـەیـەك باوکی لە دایـەرەهـاتـەوە . روگرژ وتاڵ بوو . وەڵام سەلامـەکـەی ئولـدوزیشی نەدایـەوە . دانیشاوهاتە سەر سفرەو دەستی بە خواردن کرد . وەکـو ئەمـەی دیسـان سەرۆکی دایەرەکەی قسەی پێ‌وتبێ . هێنـدەی نەمـابـوو بۆنی پەتـانـەی سورکـراوە . ئولدور لەبورەوەببا سەیری باوکی دەکرد کە چۆن نان دەخوا ئاوی‌دەمی قوت دەدایەوە . نەی دەتوانێ شتێـك هەڵگـرێ و بیخوا . باوەژنی هەمیشـە پێی دەوت : منداڵ هەقی ئەوەی نی‌یـە خۆی دەست بۆخـواردن درێـژکـاو بیخوا . پێوویستە لەخۆی گەورەتر خواردنی بۆ تێکاو ، بیخوا .

● با «مام قەلەرەش» بناسین .

مانگی . شەهـریـوەر بوو نانی نیـوەرۆیـان دەخـوارد ، باوکی و باوەژنی خەویـان دەهـات ، دەخـەوتن . ئولـدوزیش ناچـار بووبنوێ . دەنا باوکی بەسەریدا دەیقیژ اندو دەیووت : ـ دەبێ منداڵ فراوین بخواو نیوێ .

ئولـدوز هیـچ وەختێـك تێنـەدەگەیشت بۆچی هەردەبێ بنوێ . لە دڵی خۆیـدا دەیـوت : ـ ئیتـر ئیمـرۆکـەش ناتـوانم بخـەوم . ئەگەر بنووم ، پور قەلەرەش دێت و من نابینێ ، دوباره بەچکەکەی دەباتەوە .

لە دامـەنی ژ ورەکـەوە درێـژ بـوو ، خەوی لەخـۆی خست . وەختێـك باوکی و باوەژنی خەوبـردنیـەوە ، بەپێ‌دزە ، لەسـەرەخـۆ هەڵـساو چووە حەوشـەوە ، لەژ یـر سێبـەری دارتـودا دانیشت . کە قەلـەرەشـەکە گەیشتە سەرسـەری سێ‌جـاران ئەنگـوستـەکـانی ژمـاردبـوو . یەکەم جار لەسەر سوانـدەوە نیشت ، سەیـری ئولدوزی کرد . ئولدوز بە ئیشارەت پێی‌ووت

دەتوانی بێتە خوارەوە. پور قەلەرەش هات لەتەنیشتیدا نیشتەوە.

بێچوە قەلەرەشێکی. بچکۆلەی جوانیشی لەگەڵ خۆیدا هێنا بوو.

ووتی: ـ دەترسام خەوتبی.

ئولدوز وتی: ـ هەمووروژ دەخەوتم. ئیمرۆ باوکم و باوەژنم خەواندو خۆم نەنووستم.

پورە قەلەرەش وتی: ـ ئافەرین، کارێکی باشت کرد. وەخت زۆر هەیە بۆ نووستن. ئەگەر بەروژ نجەوی، ئەدی شەوان چی دەکەی؟

ئولدوز وتی: ـ ئەمەیان بەباوەژنم بلێ... بێچووە قەلت بۆم هێنا؟ چەندە جوانە!

پور قەلەرەش بێچووەکەی دایەدەست ئولدوزەوە. زۆر روح پەرەبوو. لەناکاو ئولدوز ئاخێکی هەڵکێشا. پور قەلەرەش وتی: ـ بۆ ئاهت... هەڵکێشا؟ ئولدوز وتی: ـ بوکەشوشەکەم بیرکەوتەوە. کاشکێ لەلام بایە، هەرسێکمان بەیەکەوە یاریمان دەکرد.

پور قەلەرەش وتی: ـ خەمی بۆمەخۆ. کچی گەورەی یەکێك لە نەوەکانم چەندروژە هێلکەی کردووە بێچووی دەبێ. یەکێکت لەوان بۆ دەهێنم، بۆخۆتان دەبنە سێ هاورێ.

ئولدوز وتی: ـ مەگەر خۆت بێچووی دیکەت نیە؟

پورە قەل وتی: ـ بۆچی، هەمە. سێ تریشم هەیە.

ئولدوز وتی: ـ کەواتە هی خۆت بێنە.

قەلەرەش وتی: ـ ئەووەختە من تەنیا دەمێنمەوە. مامە قەلەرەشیش هەیە. ریگانادا. ئەمەیشس کە بۆم هێناوی ئیستا زمانی نەپژاوە. بەرێ وەدەروا، فرین نازانێ. تاکو هەفتەیەك زمانی دەکرێتەوە. هەتا دوو هەفتەی تریش ئینجا دەتوانێ بفرێ. ئاگاداری بە کەتا دوو هەفتەی تر باڵ بگرێ و بنوانێ بفرێ. دەنا ئیتر هیچ کاتێك ناتوانی باڵ بکوتێ. لەیادت بێ.

ئولدوز وتی: ـ ئەی ئەگەر نەیتوانی بفرێ چیبکەم؟

پور قەلەرەش وتی: ـ مەعلومت لێ بێ کەوا دمرێ. دەزانی چ خواردنێکی دەدەیتێ؟

ئولدوز وتی: ـ نا، نمازانم.

پور قەلەرەش وتی: ـ هەمووروژێك پارچە سابونێك. نەختێك گۆشت و ئەم جۆرە شتانە. ئەگەر هەشبوو، ناوناوە ماسی یەکی بچکۆلە. لەناو حەوزەکەدا ماسیتان زۆر هەیە، کرمیش دەخوا. پەنیریش دەخوا.

ئولدوز وتی: ـ زۆر باشە.

پور قەلەرەش وتی: ـ باوەژنت لێتدەگەرێ ئاگاداری بکەی؟

ئولدوز وتی: ـ نا. باوەژنم چاوی بەم شتانە هەڵنایە. دەبێ بێ شێرمەوە.

بێچوە قەلەرەشەکە لەباوەشی ئولدوز قرەقری دەکرد. دەنوکی دەکردەوەو، بەسەبری دەستەکانی ئولدوزی دەگرت و بەرەولای دەکرد. چاوە بچکۆلەکانی دەبرسیکانەوە. پێیەکانی ناسکك بوون وەکو پەنجەکانی ئولدوز وابوون. پەرەکانی چەند نەرم بوون وەك پەرەکانی دایکی زبرنەبوون. لەدایکیشی جوانتربوو.

پور قەلەرەش وتی: ـ باشە، دەتەوێ لەکوێی بشاریتەوە؟

ئولدوز بیری لەمەیان نەکردبۆوە. کەوتە بیرکردنەوە. کوێندەری هەبوو دەویست؟ هیچ شوێنێك. وتی: ـ لەناو گل و دارەکاندا دەیشارمەوە.

پور قەلەرەش وتی: ـ نابێ، باوەژنت دەیبینێ. جگەلەوە، وەختێ گوڵەکان ئاودەدا، مندالەکەم تەردەبێ و دەخوسێتەوەو سەرمای دەبێ.

ئولدوز وتی: ـ ئەدی لەکوێی بشارمەوە؟

قەلەرەش سەیرێکی ئەم لاو ئەولای کرد ووتی: ـ لەژێر پەیژەدا باشترە قادرمە دەکەوێتە پشت بانەوە. لەشارو لادێکاندا ئەم قادرمانە گەلی زۆرن. ژێر قادرمە کۆلیتی مریشك بوو بەلام ناو هێلانەکە فراوان بوو. بێچوە قەلەکەیان لەوێ داناو دەرگایشیان داخست تاکو پشیلە نەیخواو باوەژنیش هەستی پێ نەکا. کونێك لە بنەوەی دەرگاکەبوو بێچووە قەلەکە دەیتوانی هەناسەی ی لیوە بکێشێ.

ئولدوز بە پور قەلەرەشی وت: ـ پورە قەلەرەش، ئەمە ناوی چیە؟

پور قەلەرەش وتی: ـ پێی بلێ «کاکە قەلەرەش».

ئولدوز وتی: ـ وادیارە کورە؟

پور قەلەرەش: ـ بەلێ.

ئولدوز وتی: ـ هەموو قەلەرەشەکان یەك شێوەن چۆن دەزانین کورە؟

پور قەلەرەش وتی: ئێوە وای تێدەگەن. کەمێکی لێ ورد بیتەوە دەزانی کە کورە یان کچ، کچ و کور فەرق دەکەن، لەسەرورویانەوە دیارە.

کە مێکیش لەبارەی ئەم و ئەووەوە قسەیان کردو ئینجا لێك جیابونەوە. ئولدور چوە ژ ورەوە، راکشا، چاوەکانی نوقاند. وەختێ باوەژن بەئاگاهات، بینی ئائێستاش ئولدوز خەوتووە بەلام لەراستی دا ئولدوز نەخەوتبوو خەوی نەدەهات، لەبیری کاکە قەلەرەش بوو. بەژێر چاوەوە سەیری باوەژنی دەکردو لە دڵی خویشیدا پێدەکەنی.

* ـ جالجالۆکەی خۆشمەزە.

چەند روژێك رابورد. ئولدوز زۆر شادمان و خۆشحاڵ ببوو. باوکی و باوەژنی سەیری پێدەهات. شەوێك باوەژن بەمێردەکەی وت: ـ نازانم ئەم مندالە چی یەتی. هەموو دەم پێدەکەنێ و سەمادەکا. لەسەر خەیالی خۆی نیە. دەبێ رەگ و ریشەی کارەکەی دەربهێنم.

ئولدوز کوێی لەم قسانەبوو. لەدڵی خۆیدا وتی: دەبێ زیاتر ئاگام لەخۆبێ.

هەموو روژێ سێ جاران سەری لە بێچوە قەلەکە دەدا. وەختێ ماڵ چۆڵ دەبوو، بێچووە قەلەرەشەکەی لەکولانەکە دەردەهێنا، یاریان دەکرد. ئولدوز فێرەقسەی دەکرد. ناوناوە پور قەلەرەشیش دەهات، شتێکیشی بۆ بێچووەکەی دەهێنا، لەتە گۆشتێك یان پارچە سابونێك شتێکی لەم بابەتانەی بۆدەهێنا.

جارێکیان دوو جالجالۆکەی هێنابوو. جالجالۆکەکان لەناو دەنوکی

پوره قەلەرەشدابوون، پەلە قاژەیان بوو، نەیان دەتوانی خۆیان دەربازکەن، پێیەکانیان چ درێژ بوون! ئولدوز لێیان ترسا. پور قەلەرەش وتی: ـ مەترسێ گیانەکەم، سەیرکە نیرانە بێچووەکەم چۆن دەیان خوا.

لەراستیدا بێچووە قەلەرەش زۆر بەتام دەیخواردن و قوتی دەدان پاشدان دەنوکەکانیان چەندجارێکك چەپ و راست بەزەوی داهێناو وتی: ـ دایەگیان، ئیتریشم لەمانە بۆ بێنە زۆر خۆش و بەتام بوون.

دایکی وتی: ـ زۆرباشە بۆت دەهێنمەوە.

ئولدوز وتی: ـ لە موبەقی ئێمەدا، زۆرمان هەیە. بۆت دەهێنم بێچووە قەلەکە ئاوی دەمی قوت دایەوەو سوپاسی کرد. لەو رۆژە بەدواوە ئولدوز بەم بەرو ئەویەردا دەگەرا، جالجالۆکەی راوەکردو لەباخەڵی کراسی دەتان، قۆپچەکانیشی دادەخست تا نەیەتە دەرەوە، پاشدان لەفرسەتێکك دا دەیبردن و دەیدانە کاکە قەلەرەش. هەڵبەتە ئەمەی بۆ بەخواردن حیساب نەدەکرا. ئەمانە لەباتی سیسرکەو قەندو نوقل و شیرینی و ئەم جۆرە شتانەبوو. پور قەلەرەش وتبوی کە ئەگەر هەرشتێکی زیندو خۆراك نەخوا دەمرێ، هیچ شتێکك ناتوانێ بیژیەنێ. نەخێر هیچ شتێکك، مەگەر خۆراك.

رۆژێکیان لەسەر نان خواردنی نیوەرۆدا، باوەژن بینی کەوا چەند جاڵجالۆکەیەکی دەست و قاچ شکاو لەسەر کەوڵی نان خواردندا دەرۆن. ئولدوز زانی کە لەباخەڵی خۆیەوە هاتونەدەرەوە. دڵی کەوتە تەپەتەپ. یەکەمجار ویستی کۆیان بکاتەوەو بیان خاتەوە باخەڵی پاشدان بیری‌کردەوە کەوا باشترە بەسەرخۆیدا نەهێنێ. باوەژن پێیەکانی گرتن و فرێیدانە دەرەوە. بەڵام بەخێر گەراوە.

پاش فراوین کردن ئولدوز چوە سۆراغی بێچوە قەلەرەشەکە تا ئەو جاڵجالۆکانەی دەرخواردبداکە ماونەتەوە. یەك دوو جاڵجالۆکەی تریشی لەکون و قوژبنی حەوشەوە پەیداکردبوو. یەکێکی بەدوئەنگوست گرتبو کە بیخاتە دەمی بێچووە قەلەکەوە. ئەمە لە پور قەلەرەشەوە فێرببوو کەچۆن بە دەنوکی خۆی خواردنی لەدەمی بێچووەکەی دەنا.

بێچووە قەلەکە دەیویست خۆی جاڵجالۆکەکە بگرێ و کە لەناکاو چەندی‌کردی سەری کشاندە دواوەو وتی: ـ ئولدوز گیان ناخۆم.

بێچووە ئاخر بۆچی بێچووە قەلەرەشەکەم؟

بێچووە قەلە رەشەکە وتی: ـ سەیری نینۆکەکانت کە چەندە درێژ ن؟

ئولدوز وتی: ـ ئینجا چیە درێژ ن؟

بێچووە قەلەرەشە کەوتی: ـ درێژ، پیس، رەش! بمبورە ئولدوزخان، من ناتوانم خواردنێکك بخۆم کە.. تێ‌دەگەی ئولدوز خان؟

ئولدوز وتی: ـ تێگەیشتم. زۆرسوپاست دەکەم کە عەیبی منت لەبەرەو رومدا ووت. باوەربکە ئیتر من خۆشم ناتوانم بەم نینۆکە پیسانە خواردن بخۆم.

● دادوبێدان لەسەر ماسی و بریاری خنکاندنی پور قەلەرەش لەناو حەوزدا چەندماسیەکی سووری بچکۆلە هەبوورۆژی شەشەم یان هەفتەم بوو ئولدوز یەکێکیانی بەجام گرت و دایە بێچووە قەلەکەو ئەویش قوتی‌دا. یەکەمین ماسی بوو لەژیانیدا دەیخوارد. لەدایکی بیستبوکە راوی ماسی و قوت دانی زۆر خۆش و بەتامە، بەڵام نەیبینی بووکە چۆنە.

دایکی ئەو وەك باوەژنی ئولدوزنەبوو، زۆرشتی دەزانی. دەیزانی کە چی بۆ بەچکەکەی باشەو چی خراپە. ئەگەر بێچووەکەی شتێکی خراپی لێ‌داوا بکردبا بەسەری دانەی دەقیژاند. دەیوت: ـ رۆڵەی شیرینم، ئەمەیانت بۆ ناهێنم، چونکە فلانە زیانی هەیە، لەبەرئەوەی ئەگەر فیسارە خواردن بخۆی ناتوانی بەباشی قرە قر بکەی، چونکە دەنگت دەگرێ، لەبەرئەوەی...

عەیی هەموو شتێکی دەوت. بەڵام باوەژن بەم جۆرە نەبوو. هەمیشە بەروویەکی ترش وتاڵەوە دەیووت: ـ ئولدوز، فلان ئیش مەکە، خۆت لەوشتە مەدە، مەچووە فیسارە شوێن، ئەوهامەکە، راست دانیشە، بەدەنگی بەرز قسەمەکە، بۆچی فسکەمسك دەکەی، لەم بابەتە قسانە. باوەژن هیچ وەختێك پێی نەدەوت بۆچی نابێ بەدەنگی بەرز قسەبکەی، بۆچی دەبێ پاشی نیوەرۆ بخەوی. ئولدوز لەسەرەتادا وای دەزانی کە هەموو دایکێك وەك باوەژنن. پاش ئەوەی لەگەڵ پورە قەلەرەشدا دۆستایەتی و ئاشنایەتیان پەیداکرد. بیریشی گۆرا.

. باوەژن بۆرۆژی دوایی تێگەیشت کە یەکێك لە ماسی‌یەکان نەماوە. دادو هاواری گەیشتە ئاسمان. لەسەر نانی نیوەرۆ بە مێردەکەی وت: ـ ئەم نیشە ئیشی قەلەرەشە. هەر ئەو قەلەرەشەی کە دێت لەرۆخ حەوزەوە سابون دەدزێ. زۆریش چاوقایمە. ئەگەر وەرگیرم بێ، دارکاری دەکەم؛ دەی خنکێنم.

زۆر جوێنی پیس پیسی بەپورە قەلەرەشدا. ئولدوز دەنگی لێوە دەرنەهات. گەر قسەیەکی کردبایە باوەژن بۆنی دەکرد کە ئەو دەستی لەگەڵ قەلەرەشدایە. بەتایبەتی لەرۆژی پێشتردا کە هێندە نەمابو لەرۆخ حەوز بیگرێ.

باوکە وتی: ـ لەراستیدا قەلەرەشەکان تەیریکی پیسن، دێڵە دزن بەحسێب قەلەرەشێکم لەهەموو ژیانمدانەدیوە. زۆر ئاکادارە. دەنا، نایەڵێ یەك ماسی لەناو حەوزدا بمینێ.

باوەژن وتی: ـ بەڵێ، دەبێ ئاگاداربم. ئێستا تام و چێژی لێ‌وەرگرتووە، حەزدەکا هەموویان بگرێ.

ئولدوز لەدڵی خۆیدا بە ناتێگەیشتویی دایکی پێکەنی. چونکە قەلە رەشەکان ددانیان نیە. پور قەلەرەش خۆی دەیووت.

پورقەلەرەش زۆرشت دەزانێ.

لەمردن ناترسێ.

نیوەرۆ پورە قەلەرەش هات. هەموو نووستبون. هەردوکیان پێکەوە لە ژێر دارتودانیشتن. ئولدوز هەمووشتێکی باس کرد.

پور قەلەرەش وتی: ـ هەربیریشی لێ‌مەکەوە، گەر باوەژنت بیەوێ من بگرێ هەردوو چاوەکانی دەر دەهێنم.

ئینجا کاکە قەلەرەشەکەیان لە هێلانەکەدا دەرهێناو بێچوە قەلەکە زمانی کرابۆوە. هەڵبەتە وەك ئولدوزو دایکی باش قسەی نەدەکرد. بەڵام لەچاو

خۆیدا خراپی قسە نەدەکرد. نەختێك لەلای گوڵ و دارەکان قەلەمبازی لێداو، بەم بەروئەوبەردا ڕۆیشت پاڵەفرەی کردو پاشدان هات لەتەنیشت دایکیەوە دانیشت، دایکی فێریکرد کەوا چۆن کە چۆن کێچ و ئەسپێ بە دەنوکەکانی بگرێو بکوژێ.

پورە قەل برینێکی لەژێر باڵی پەیدا هەبوو. برینەکەی پیشانی ئولدوزو بێچووەکەیدا ووتی: - ئەم برینە پەنجا شەشت ساڵە لە لەشمە چوبومە سابون دزین، سابون کەرەکە بە دار لێیدام و برینداری کردم. پەنجا ساڵی تەواوی کێشا تاکو برینەکەم اریژ بوو. نەختێکم میوەی دەشت و بیابان پەیداکردو خواردم، لەدوایی دا چاك بوومەوە.

ئولدوز لە زانایی و دانایی پورە قەلەرەش دا سەری دەسورما. هەزار خۆزگەی دەکرد دایکێکی وەك ئەوی هەبایە. دایکی خۆی بەبیر نەدەهات تەنیا ڕۆژ ێك لەدەمی باوەژنی بیستبوو کە دایکێکی دیکەشی هەیە: - ڕۆژ ێك باوکی و باوەژنی شەریان دەکرد. باوەژنی ووتی: کچەکەشت بەلادێ، لەلای دایکی بەرەلای کە، من چیتر ناتوانم خزمەتکاری ئەویش بکەم. هەر ئێمرو سبەیەکە خۆم دەبمە خاوەن منداڵ.

لەراشیشدا سکی باوەژنی گەورە بوو کاتی منداڵ بوونیشی هاتبوو یەك دوو جاریش مامی ئولدوز چەندشتێکی لەبارەی دایکی ئولدوزەوە وتبوو. مامی ناوناوە لەدێوە دەهات و سەربیشی لەوان دەدا.

ئولدوز تەنیا ئەوەندەی دەزانی دایکی لەلادێدا دەژ یو ئەویشی زۆرخۆش دەوێ. شتێکی تری لەبارەوە نەدەزانی ئەو ڕۆژە پور قەلەرەش ئولدوزی ماچ کرد، بێچوە کەیشی ماچ کردو هەلفڕیو لەسەر سواندەدا نیشتەوە کە بەرەو شاری قەلەرەشان بڕواتەوە. ئولدوز وتی: - سەلامی من بە بەچکەکان و مامە قەلەرەش بگەیەنە.

پاشدان بە بیری هاتەوە کە شتێکیش بۆبێچووەکان بنێرێ. مەمکۆڵەیەکی لەناو باخەڵی کراسیدا هەبوو. باوەژنی بۆی کڕیبوو کەریهێناو، بەقادرمەدا سەرکەوتە سەربان، مەمکۆڵەکەی دایە پورە قەلەرەش تاکو بیداتە بێچووەکانی. ئەو وەختە پورە قەل فڕیو چوە لەسەر دار تەورێزیەکدا هەلنیشتەوە. ڕووی لەلای ئولدوز کرد. قرەقرێکی کردو فڕیو ڕۆیشت هەر ڕوۆیشت تا لە چاواندا ون بوو.

* دیدارێکی کورت لەگەڵ (یەشار)دا.

ئولدوز لەسەرباندا ڕاوەستابوو.

لەناکاودا بەبیری هاتە کە بەدزی باوەژنی هاتۆتە سەربانەوە کەمێك ترسا. سەیرێکی حەوشەو خانوەکانی دەوروبەری کرد. ئای سەربان چەندەجوان بوو. سەیری حەوشەی جیرانی دەستە چەپی کرد. ئێرە ماڵی «یەشار»بوو. لەنکاوێك یەشار سەبرسەبر هاتە دەرەوە، چوولەلای کۆلیتی سەگەوە دانیشت کە هەمیشە خالی بوو. یەشار دووسێ ساڵ لە ئولدوز گەورەتر بوو. کورێکی زرنگك و میهرەبان بوو. ئولدور هەرچەندی کردی تا یەشار ببینێ، نەیبینی. نەیشی دەتوانی دەنگی هەڵبڕێ. خەریك بوو دەست لەوەدا بشوا کە یاشار ببینێ کەچی یا شار سەری بڵندکرد، ئەوی بینی. لەسەرەتادا ماتییەك بردیەوە، پاشدان بەخۆشحاڵیەوە هاتە سەر دیوارو ووتی: - تۆلێرە چیدەکەی، ئوڵدوز؟

ئولدوز وتی: - دڵم تەنگك بوو، وتم بچمە سەربان نەختێكك سەیری ئەم لاو ئەولابکەم.

یەشاروتی: - باوەژنت لەکوێیە؟

ئولدوز هەموو شتێکی لە بیرچووبووە. کە ئەم قسەیەی بیست بەبیری هاتەوە کە بێچووە قەلەرەشەکەی لە حەوشەدا بەرەلاکردوە، ڕەنگە باوەژنی بێزار بێتەوە، ئەوکاتە.. وای بەحاڵی! چی بەسەر دێنێ! بەترس و لەرزەوە لە یەشار جیابۆوەو چووە خوارەوە. بێچووە قەلە ڕەشەکەت گرت و خستیەوە ناو کۆلیت. خەریك بوو دەرگاکەی پێوەدەدا کە دەنگی باوەژنی بەرزبۆوە: ئولدوز چویە کوێ لەکوێ خۆت شاردوتەوە؟ بۆچی وەڵام نادەیتەوە؟ ئولدوز دڵی داخورپا. یەکەمجار نەیتوانی هیچ بڵێ. [illegible]اشدان تۆرێ هێزی دایەوە بەرخۆی ووتی: - دایە لێرەم، بۆخۆم دەسور[illegible]ەوە.

ئیتر باوەژ ن هیچی نەوت. بەڵا بەخێرو خۆشی کەوتەوە.

* خنکاندنی پور قەلەرەش.

بەیانی سەر لەزوو ئولدوز لەخەو هەڵسا. پورە قەلەرەش قرە قری بووو داوای یارمەتی دەکرد. وەك ئەوەی خەریکن کەسێك دەکوژ ن قرەقری بوو. ئولدوز بەپەلە پروزێ بۆحەوشە ڕایکرد. بینی باوەژنی لەژێر دارتوەکەدا ڕاوەستاوە، پور قەلەرەشی بەدارەوە هەلواسیوە، ئەویش قرەقریەتی، باوەژ ن بەدار لێیدەدا و جوێن دەدا. دەم وچاوی باوەژ ن بریندار بوو خوێنی لێ دەتکا. قەلەرەشیش پەلە قاژەی بوو باڵی دەکوتاو قرەقری دەکرد. بەپێیەکانیەوە شۆڕ ببۆوە.

ئولدوز خویشی نەیزانی چکاتێکك خۆی لە باوەژنی کرد، قاچەکانی گرت و بەهەموو هێزی گەستی. باوەژنی زریکاندی: - ئا... خ! و ئولدوز فڕێدایە ئەولاوە. زللەیەکی قایمی لە بناگوێدا سریوان.. ئولدوز کەوت. سەری بە بەردەکاندا کەوت، لەهۆش چوو ئیتر نەیزانی چیڕویدا.

* خەونی پەرێشانی ئولدوز.

ئولدوز کاتی نیوەڕۆ چاوەکانی هەڵهێنا. چەند کەسێکی جیرانەکانیشیان لەسەر سەری دابوون. باوەژنی لەژێر سەری دانیشتبو. بە کەوچك دەرمانی لەدەمی ئولدوز دەکرد. نێوچەوان و چاوێکی بەدەسماڵێلی سپی پێچابوو. چاوەکانی ئولدوز ڕەشکەو پێشکەی دەکرد. پاشدان یەك یەك خەڵکەکەی ناسییەوە. یەشاریشی بینی کە لەتەنیشت دایکیەوە دانیشتبو چاوی لە ئولدوز بری بوو.

باوەژ ن کەبینی ئولدوز چاوەکانی کردەوە، بەترس و لەرزەوە وتی: - سوپاس بر خوا! چاوەکانی کردەوە. ئیتر نامرێ.

ئولدوز!... قسە بکە!

ئولدوز نەیدەتوانی قسەبکا. ڕوی لەلای باوەژنی کرد. لەناکاو دەنگی پورقەلەرەش لەهەموولایەکەوە بەرزبۆوە. ئولدوز وەك شێت قژ ی باوەژنی گرت و قیژاندی.

بەڵام سەری هێندە ژانی کرد دەستەکانی شل بوون و دەنگی نەما. ئەو

وەختــە نورە نورە دەنگی گریــانی بەرز بۆوەو وتی: ـ پورەقـەلـەرەش . . لەکــوێیــە؟ لەکــوێیـە؟ . . کوانێ پور قەلـەرەش؟ بێچـووە قەلـەکـە چی لێهات؟ . . دایە! . . دایە!

یەشـار لەپێش هەمـوویـان غاریدایە . . هەرکەسە قسەیەکی دەکردوو دیـوویـست هێمنی کاتـەوە . بەڵام ئولـدوز نوکەنوکی بوودەگریا . باوەژنی دڵی دەدایــەوەو. نەرم نەرم قســەی دەکــرد . دەیـووت؛ ـ ئولـدوزگیـان مەگری ، دەرمانەکانت بخۆی زووچاك دەبیتەوە .

لەئـەنجامدا ئولدوز لەگریان کەوت و خەوبردیەوە . لە خەوندا بینی کە پورە قەلــەرەش بەدارتــودا شۆربــۆتـەوە ، خەریکـە دەخنکێ ، دەڵێ : ـ ئولدوز، من رۆشـتم ، قسەکانم لەبیر مەکە ، مەترسە! ئولدوز رایکردە لای دارتووەکە . لەناکاودا باوەژن لەپشت دارەکەدا هاتەدەرەوە ، ویستی شەقی تێهـەڵــدا . ئولـدوز زیــرانــدیو بەتـرسـەوە لەخـەو راپـەڕیو دەستی بەگــریـان کرد . لەم کاتـەدا تەنیـا باوکیو باوەژنی لەژ ورەوە بوون . دیسان خەوتـەوە . کەمێـك پاشتـر هەمـان خەوی بینی یـەوە ، قیـژانـدیولەخـەو راپــەڕییــەوە . تا شەو هەر بەم جۆرە رادەپــەڕیو دەنــووســتــەوە . لەنکاوێکیشەو کەچاوی کردەوە بینی ئەوە . پزیشك خەریکە چارەیدەکا . پاشدان گۆیی لێبوو کە پزیشك بەباوکی دەڵێ : ـ برینەکەی زۆرگرنگ نیـە . زووچـاك دەبێتـەوە . بەڵام زۆرتـرسـاوە . زۆرادەچـەنێ . لەشتێـك زۆرترساوە . ئێستا دەرییەکی لێدەدەم . هێمن دەبێتەوەو دەنوێ .

ئولدوز وتی : ـ من برسیمە .

باوەژنی شیری بۆهێنا . ئولدوز شیرەکەی خواردەوە .

پزیشـك دەرزییـەکـەی لێـداو، جانتاکەی هەڵگرت و رۆیشتوئولدوز سەیــری بن ساپیتــەی دەکــردو هیچی نەدەوت . دەیــوویست گوێی لەقسەکانی باوکیو باوەژنی راگرێ . بەڵام زۆری گوێلێنەبوو. خەوبردیەوە .

*** دەردی دڵی بێچووە قەلەرەش و**

*** پور قەلەرەش چۆن گرفتار بوو .**

بەیــانی زوو ئولـدوز کەوتـە بیـری قەلـەرەش . دەستی لەرزی ، چای رژانـدە سەرلێفـە . باوەژن هەردووچاوی چووە پشتیسەری بەڵام هیچی نەووت باوکی لەسـەرپێبـوو. شەروالی لەپێدەکرد تاکو بۆ دایەرە بروا . ئولـدوز دەیـوویست هەڵسێ و بچێتـە لای بیچـووە قەلـەکە بەڵام کارێکی ژیرانە نەبوو. نەیدەزانی چی بەسەر بێچووە قەلەرەشەکەدا هاتووە ، وچۆن پور قەلـەرەشی دەستگیربووە ، ئەوەش بەیانی زوو . باوەژن دەسماڵەکەی لەچــاوی بەستبـوو کردبـوویـەوە . شوێن دەنـوکی پورقـەلـەرەش لەسـەر دەم چاویــدا دیــاربـوو. باوکی ئولـدوز کە رۆیشت باوەژنی وتی : ـ من دەچمـە لای دایکی یەشار خێرا دەگەرێمەوە لەمێژە نەچویمە حەمام . ئەم جارە ناتـوانم تۆ لەگـەڵ خۆمدا ببمەم ، دەمەوێ بزانم دایکی یەشار ناتونێ لەگەڵمدا بێتە حەمام .

باوەژن زۆرزۆر میهـرەیان ببوو . هیچوەختێك بەم جۆرە قسەی لەگەڵ ئولـدوز نەکـردبـوو . بەڵام ئولدوز نەیدەوویست قسـەی لەگەڵدا بکا . رقی لێی دەبـۆوە ، لەنکـاوێکـك شتێکی بەبیـرداهـات ووتی : ـ بایە ئێستا تۆ دەچیتە حەمام ، بەیاشا ریش بڵێ بێتەئێرە . من بەتەنیا بێ تاقەت دەبم .

باوەژن کەمێك ناوچەوانی گرژکرد و گوتی : ـ یەشار دەچێتە قوتابخانە ئولــدوز هیچی نەوت . باوەژن رۆیشت . ئولــدوز هەڵســاو بەسۆراغی بێچووە قەلە رەشدا چوو. قەلەی ئولدوز لەناو ریقنەدا کزببوو فرمێــسکی هەڵدەرێژت .

کە تولدوزی بینی وتی : ئای ، لەئەنجامدا هاتی !

ئولدوزوتی : ـ بمبورە بەتەنیام جێهێشتی .

بێچـووە قەلـەرەش وتی : ـ ئێستـا شتێکم بۆبێنە بیخۆم ، پاشدان قسە دەکەین . زۆرم برسییە ، زۆرم تێنووە .

ئولـدوز چوو ئاوو خواردنی بۆهێنـا ، قەلەرەشۆکەیش هێندێکی خواردو وتی : ـ من وام بەیرداهات تۆش بەدوای دایکمدا چوویی .

ئولدوز وتی : ـ دایکت بۆکوێ چوو؟

قەلـەرەشـەکـە کە وتی : ـ هیـچ شوێنێـك . باوەژنت هێنـدەی لێـدا . تا مرداربۆوە پاشدان نازانم فرێیدایە زبڵخانە یان فرێی دایەکوێ .

ئولــدوز دایــەگــریــان و: ـ چ ئاخیــر و عاقیبـەتێکـە! ئێستـا سەگ پارچەپارچەیان کردووەو خواردویانە .

بێچـووە قەلـەرەشەکە وتی : ـ هەرگیز نابێ! ئاخر ئێمە گۆشتمان تاڵە . هەتـا سەگیش ناتـوانێ دەم لەگـۆشتی ئێمـەبـدات . مرداری ئێمـە هێندە لەســەر زەویــدا دەمێنێتــەوە تا دەرزێو دبتەوە خۆڵ . نەخێر ئیللەن دایکمی فریداوەتە زبلخانە یان جێگایەکی ترو بۆخۆی دەرزێ .

ئولـدوز نەیتـوانی جلەوی خۆی بگـرێ ، لەپرمەی گریانیدا . بێچووە قەلـەرەشـەکـەش گریا . لەئەنجامدا ئولدوزوتی : ـ ئێستا باوەژن دێتەوە ، دەمــان بینێ ، من دەرۆم . پاشـــدان کە باوەژن بۆحەمـام چوو، دیــسان دێمـەوەلات . ئینجـا دەرگـای کۆلیتـەکـەی داخست و چوو لەنـاو نوینـدا درێـژ بـوو. باوەژن هاتـەوە بوخچـەکـەی هەڵگـرت و رۆیشت . ئولـدوز بەبیـرێکی رەحـەتـەوە هاتـە وەلای بێچووە قەلەرەشەکەی . خۆر بەجوانی هەڵاتبـوو. قەلـەرەشۆکەکەی هێنایە دەرەوە . دەرگای کۆلیتەکەی کردەوە تا خۆر لەنـاو هێـلانـەکـە بدا . بێچـووە قەلەرەشەکە باڵەکانی پێکداکێشا . چەپ و راست دەنووکی بە زەوی داهێناو وتی : ـ بەراستی ئولدوز گیان ، ئلزادی شتێکی زۆربـاشـە ئولـدوز ئاخێکی هەڵکێشـاو وتی : ـ تۆدەترانی پورقەلەرەش بەم بەیانیزووە بۆچی هاتبوو؟

بێچووە قەلەرەشە کەوتی : ـ لەراستیدا ، هاتبوو من بباتەوەو فێرە فرینم بکــا . تیشکی خۆر هاتــەلام ، پێیوتم : ئیمـرۆ رۆژی پەرەواز بوونـە . خوشـك و براکـانت دەبـەم فێرە فرینیان دەکەم . تۆش دەبێ بێیت . پاشدا دەتهێنمـەوە . من بەدایکم وت : ئەدی ئولـدوز؟ ئاگاداری ناکەی؟ دایکم وتی : ئاگــاداری دەکـەم . دایکم دەرگـای کۆلیتـەکـەی داخست هات تۆ ئاگـادارکـاتـەوە ، ماوەیـەك رابـورد تۆنـەهـاتی . من لەناو هێلانە دابووم . لەنکــاوێکــك دەنگـەدەنگـك و بگـرو بەردەیـەکم گوێلێبـوو. دایکم قرانـدی : «قـر! . . قـ . . . ر! . . » دڵم داچڵەکا . دایکم دەیووت «مەگەر ئێمــە لەم شارەدا مافی ژیـانمـان نیـە ؟بـۆچی نابێ دوستـایـەتی لەگـەڵ

هەرکەسێکی ویستمان ببەستین ؟».

لە کەلێنی ژێــر دەرگــاوە سەیـرم کرد بینیم باوەژنت دایکمی لەژێـر بێژنگ ناوەو گرتویەتی مەعلوم هیچ لەقسەکانی دایکم نەدەگەیشتم.

ئولـدوز بێ سەبـربـوو بەخێـرایی پرسی : پاشدا چ رووی‌دا؟ بێچووە قەلــەرەش وتی : ـ پاشــدان دایکمی بەکنــدر بەستــەوە، بەدارتــوی‌دا شۆرکــردەوە. لەنکـاوێـك دا دایکم هەڵـسـاوەو دەنـوکی لە دەم وچـاوی دایکت داو برینـداری کرد. ئینجـا باوەژ ن لەکـورە هاتـەدەرەوەو هەرما بە سەڵکەبزۆت لەدایکم بدا.

ئولدوزوتی : ـ پورقەلەرەش چیتری نەوت؟

بێچــووە قەل وتی : ـ بۆچی. ووتی ئەی باوەژنی ناتێگــەیشتـو، تۆوا دەزانی کە قەلەرەشەکان حەز لەدزی دەکەن و کە یفیان پێ‌دێ؟ ئەگەر من خواردن وخۆراکم هەبێ و بتـوانم خۆم و بێچووەکـانم تێرکەم، دیارە دەبێ دزی نەخــۆشی بێ ئەگــەر جارێکی تــر دزی بکـەم؟ . . سکی خـۆتـان تێردەکەن و، وا دەزانی هەموو خەڵکی وەکو ئێوەن! . . .

بێچووە قەلەکە بێ‌دەنگ بوو. ئولدوز دەستی بەگریان کردەوەو پرسی :

ـ چیتر ؟

قەلــەرەشــۆکە کەوتی : ـ پاشدان تۆ هاتیە دەرەوە. بەتای کرسێکەوە . . ئەو یتریش خۆت دەیزانی.

چرکـەیـەك هەردوکیـان خامـۆش بوون. ئولـدوز وتی : ـ باشـە ئێستا پورەقەلە رۆیشت و تەواو! ئێستا چی‌بکەین؟

بێچووە قەلەکەوتی : ـ دەبێ من فێری فرین بم.

ئولـدوز وتی : ـ زۆر بەجێ‌یـە. من هەمـوم بیـر لەخـۆم دانـاوەولەبیرمە

بێچـوە قەلـەرەش وتی : ـ خۆزیـا باوکم، براکـانم، خوشکم، نەنە پیرەم دەیانزانی لەکوێم.

ئولدوز وتی : ـ بەڵێ، کۆمەکیان دەکردین.

قەلـەرەشـۆکـەکە : ـ لەبیر تەکەدایکم دەیوت کە تا چەند رۆژ ی تر فێرە فرین نەبم دەمرم؟

ئولدوز وتی : ـ لەبیرمە.

بێچووە قەلە وتی : ـ بەوردی‌و بێ‌هەڵە حیسابەکەی دەزانی؟

ئولدوز بەپەنجەکانی حسابی‌کردو وتی : ـ لەشەش رۆژ زیاتر ماوەمان نیە.

بێچووە قەلەرەش وتی : ـ بەرای تۆ دەبێ چی‌بکەین؟

ئولدوز وتی : ـ دەتەوێ بتدەمە یەشار، بتباتە چۆلی و فێرە فرنیت بکا.

بێچووە قەل وتی : ـ یەشار کێ‌یە؟

ئولدوز وتی : ـ هاوسێیەکەی دەستە چەپمان.

بێچوە قەلەرەش وتی : ـ ئەگەر کورێکی باش بێ‌من هیچ قسەیەکم نیە.

ئولـدوز وتی : ـ ئای کە کورێکی باشـە، دەمیشی زۆرقایم ورەحەتە. بەڵام چۆن ئاگاداری کەین؟

بێچووە قەلەرەشەکە وتی : ـ ئێستا برۆ سەربان، پێ‌ی‌بڵێ بێت وبمبا.

ئولدوز وتی : ـ ئێستا نابێ، بۆ قوتابخانە چووە.

قەلەرەشۆکە وتی : ـ قوتابخانە؟ ئێستا چەند رۆژێك لە پشوی هاوین ماوە.

ئولــدوز وتی : ـ تۆراست دەکــەی. باوەژ ن فێڵی لێ‌کـردوم. ئێستـا قوتابخانەکان داخراون. من دەچمە سەربان، تۆلێرەدا چاوەرێم بکە.

ئولــدوز ئێستــا لە پێچکــەی دوومی پەیـژەدابـوو کە دەنگی پێ‌یـەك لەکۆڵانەوە هات. ئولدوز خێرا بێچووە قەلە رەشەکەی خستەوە لانەکەی، دەرگــاکــەی داخست، چووە ژ وورەوە، لەنــاو نوێن راکشــاو چاوی لە حەوشەوە بری.

**ماڵ قەدەغە دەبێ.**

دەنگی حەپەحەپی سەگێك بیسترا. دەرگاکراوە. باوکی [illegible] ژ وورەوە پاشدان مامی، برا بچوکی باوکی بوو. سەگێکی رەشیش بەدو[illegible]انەوە هاتە ژ وورەوە. پەتکی ملی سەگەکە بەدەست مامی‌یەوە بوو.

باوکی وتی : ـ ئیتر هیچ قەلەرەشێك ناتوانێ پێ‌ی لێرە بنێ.

مامی وتی : ـ کە زستاندا هات دەبێ بێم بیبەمەوە.

باوکی وتی : ـ قەیـدی ناکـا. کە زستـانـدا هات ئێمەش پێویستیمان بەسەگ نیە.

مامی وتی : ـ ئولدوز لەکوێ‌یە؟ لەگەڵ یایی داریۆیشتووە؟

باوکی وتی : ـ نە، نەخۆشەو خەوتووە.

پەتکی سەگەکەیان لە دارتووەکەدا بەستەوەو هاتنە ژ وورەوە.

ئولدوز مامی خۆشدە وویست. زیاتر لەبەرئەوەی لەدێ‌یەکەی دایکیەوە رادەهات.

مامی تەنـدروستی پرسی، بەڵام لە بارەی دایکیــەوە هیچی نەوت، باوکی حەزی نەدەکرد لە پێش ئەودا لەبارەی ژنی یەکەمیەوە قسە بکا.

مامی بە باوکی وت : ناچیەوە دایەرە؟

باوکی وتی : ـ نا روخسـەتم وەرگرتووە، کاتیتس تێپەریووە، پاشی ئەمە قسـە هاتـە سەرباسی سەگ وقەلـەرەشـان. باوکی جوێنی بە قەلەرەشان دەداو قســەی خراپی پێ‌دەگـوتن. بۆوێنـە دەیووت کەوا قەلەرەشەکان دزو پیس و ترسنـۆکن. دێن دزی‌دەکـەن، بەڵام کە کەسێـك دەبینن دادێتـەوە بەردێك یان شتێك هەڵگرێ، بەخێرایی هەڵدەفرن.

سعـاتێـك پاش نیـوەرۆ. باوەژ ن هاتەوە. یەکەمجار سەگەکە مراندی‌و وەری، پاشـدان کەمـامی ئولـدوز لەپەنجەرەوە تێ‌ی راخوری‌و هەیدێ‌ی لێ‌کرد لە حەپە کەوت.

باوەژ ن شـەرمی لە مامی ئولدوزدەکردمامیشی لەبەرانبەری سەری لەبەر خۆی دەناو سەیری رووی براژنی نەدەکرد. ئولدوز بە خامۆشی دانیشتبو. چاوی لەمـامی. بریبـوو. لەنکـاوێکـداوتی : ـ مامە ناکرێ سەگەکەت لەگەڵ خۆت دا بیبەیتەوە؟

باوکی سەری‌سورما. مامی رووی لەلای ئولدوز کردو پرسی : ـ بۆچی بیبەمەوە؟

زمـــانی ئولــدوز گیـراو کەوتـە پرتـەوتـەتـە. نەیـدەزانی چی‌بڵێ. لە

دوایی یەکەی وتی : ـ من . . من دەترسم .

باوکی وتی : ـ برۆ بەم لاوە کورە، فزەت لەبەروەنەیە!

مامی وتی : ـ مەترسێ گیانەکەم، سەگێکی باشە . پێی دەڵێم کە نەتگرێ .

باوکی وتی : ـ لێی گەرێ وەلی کە! قسەی پیاوی ناچێتە مێشکەوە . خۆی لەهەمسوو سەگێك خراپتر گاز دەگرێ . هەر لەخۆرا بێ هیچ هۆیەك لایەنی قەلەرەشە دزەکان دەگرێ . کەس نازانێ لەم تەیرە پیس وچەپەڵانە چ چاکەیەکی بینیوە .

ئیتر ئولدوز هیچی تری نەگوت . لێفەکەی بەخۆیداداو نووستەوە کاتێ بێداربۆوە، بینی کە مامی رۆیشتوە . سەگ لە حەوشەدا حەپە حەپەیەتی و قەلەرەشەکان دەتەرێنێ .

لەورۆژە بەداوە ماڵەکەیان قەدەغەبوو . هیچ قەلەرەشێك نەیدەتوانی بێتە خوارەوەو بنیشێ . هەتا ئولدوزیش بەترس و لەرزەوە دەچووە حەوشەوە . جارێکیشیان پلە گۆشت مەرێکی بۆ بێچووە قەلەرەشەکە دەبرد کە سەگە رەش لەدەستی رفاندو خواردی، ئولدوز زیراندی و هەڵاتەژوورەوە .

● رۆژانی پەرێشانی و نیگەرانی

● برسیەتی، وترس .

ئولدوز لەناو جێگادا هاتەدەرەوە . برینی نێوچەوانی باوەژن زوو ساڕێژ بوو، بەڵام برینی سەری ئولدوز زۆری درێژە کێشا تا چاك بۆوە . رەفتاری باوەژن دووبارە گۆڕابۆوە . لەجاران خراپتر بەسەر ئولدوزدا دەیقیژاند . جێی ددانەکانی ئولدوز لە شلکەی رانیدا دیاربوو .

باری بێچووە قەلەرەش زۆرخراپ ببوو . هەمیشە برسیەتی دەکێشا . هەرچەندی ئولدوز هەوڵی دەدا نەیدەتوانی لەکاتی خۆیدا ئاوو خواردنی بداتێ . سەگەرەشەکە بەهەرچوار لادا پاسی دەکردو دەخولایەوە، پاسی هەموو دەنگە و چرپەیەکی نائاشنای دەکرد . تاکە ئومێدی ئولدوزو قەلەرەشکۆکە یەشاربوو، ئەگەر یەشار کۆمەکی بکردبان هەموو کارەکان دروست دەبوو . بەڵام نەیاندەزانی چۆن یەشار خەبەردار بکات ئولدوز لەترسی سەگ، نەدەچووە سەربانیش . یەعنی نەیدەتوانی بروا . سەگەرەش ماوەی نەدەدا . دەحەپی و هات وهاواری دەناوە دەنگ بوو گازیش بگرێ . هەمیشە لە حەوشەدا دەخولایەوە، بۆنی دەکرد .

دایکی یەشار ناوناوە دەهاتە ماڵی ئولدوز . بەڵام نەدەکرا هیچی پێ بڵێ . بەچ مەعلوم ئەویش لەژێرەوە دەستی لەگەڵ باوەژندا نەبێ؟

لەمرۆڤی ئەم زەمانە نابێ دڵنیابین و زوباوەریان پێبکەین . تازە باوەژن هیچ کاتێك ئولدوز بەتەنیا لەگەڵ کەسێك بەجێ ناهێڵێ . رۆژان رابوردن، پێنج رۆژ بە پەرێشانی و نیگەرانیەوە رابورد، رۆژێك ماوەیان لەبەردەمدا مابوو . ئولدوز دەیزانی کە بێ هەر ئەو رۆژە بێچوو قەلەرەشەکە فێرە فرین بکا . دەنا، دەمرێ . بەڵام دەیوانە چۆن فێر فرینی بکا؟ ئەمەیانی نەدەزانی .

لەدوایی دا فرسەتێك پەیدابووو توانی یەشار ببینێ . ئەورۆژە باوەژنی دەیویست بچێتە داوەت . ئولدوز وتی : ـ بابە، من لە سەگ دەترسم . ناتوانم بەتەنیا لەماڵدا بمێنمەوە .

باوەژن ناوچەوانی گرژکردو دەستی گرت و بردی بەدەستی دایکی یەشاری سپارد، ئولدوز لەدڵەوە خۆشحاڵ بوو . یەشاری لە ماڵەوەیان نەبینی . لەدایکی یەشاری پرسی : ـ ئەدی یەشار لەکوێیە؟

دایکی وتی : ـ چووە بۆقوتابخانە، گیانەکەم . لەدوێنێوە قوتابخانە کراوەتەوە . ئولدوز دانیشت و چاوەڕوانی یەشاری کرد .

* نەخشە لەپیناوی ئازاد کردنی بێچووە قەلەرەشەکە .

نیوەڕۆبوو، یەشار بەراکردن هاتەوە . کە ئولدوزی بینی، سور هەڵگەراو سلاوی کرد . ئولدوز وەلامی سلاوەکەی دایەوە . یەشار خوشکێکی شیرەخۆرەشی هەبوو . دایکی شیری دەدایە تاوەکو بخەوێ . ئولدوز و یەشار چوونە حەوشەوە .

ئولدوز بەهێمنی و غەمگینیەوە وتی : ـ یەشار دەزانی چی بووە؟

یەشار وتی : نا .

ئولدوز وتی : ـ قەلەرەشۆکە خەریکە دەمرێ .

یەشار وتی : ـ کامە قەلەرەشۆکە؟

ئولدوز وتی : ـ بێچووە قەلەرەشۆکەکەی من!

یەشاروتی : ـ دیارە تۆ قەلەرەشیشت هەیە؟

ئولدوز وتی : ـ بەڵێ هەمە . ئێستا چی بکەین؟

یەشار بەهەڵچوونێکەوە پرسی : ـ لەکوێ وەرگیرت کەوتووە؟

ئولدوز وتی : ـ پاشدان پێت دەڵێم، ئێستا چ دەڵێی بیکەین؟

یەشار وتی : ـ لەبرسان دەمرێ؟

ئولدوز وتی : نا .

یاشار وتی : ـ بریندارە؟

ئولدوز وتی : ـ نا .

یەشار وتی : ـ ئاخر بۆچی دەمرێ؟

ئولدوز وتی : ـ ناتوانێ بفرێ . گەر قەلەرەش نەتوانێ بفرێ، دەمرێ .

یەشار وتی : ـ بیدە من فێری بکەم .

ئولدوز وتی : ـ لەژێر قادرمەدا شاردومەتەوە .

یەشار وتی : ـ باوەژنت دەزانێ؟

ئولدوز وتی : ـ ئەگەر هەستی پێ بکا، دەیکوژێ .

یەشار وتی : ـ دەبێ فێلێك بکەین .

ئولدوز وتی : ـ دەبی یەکەم جار فێل لەسەگەکە بکەین . مەگەر گوێت لە دەنگی نیە؟

یەشار وتی : ـ بۆچی، گوێم لێیەتی . سەگەکە نایەڵی بێچووە قەلەرەشەکە بێنمە دەرەوە . یەك دوورۆژ مۆلەتم بدەیە، بیرێکی لێ بکەمەوە، نەخشەیەکی بۆبکێشم، تاشتێکی بۆبکەم .

ئولدوز وتی : ـ ماوەم نیە . دەبێ هەر ئیمرۆ قەلەرەشۆکەکە بەینە دەرەوە . دەنا دەمرێ . پورە قەلەرەش بەمنی ووت یەشار جۆشی

خواردبوو. هەستی دەکرد کە زۆرکاری پر لەجۆش و خرۆرش لەپێشە.
بەخێرایی پرسی: ئەدی پور قەلەرەش کێ یە؟

ئولدوز وتی: ـ دایکی قەلەرەشۆکەیە. ئەمانەت لەدوایی دا پێ دەڵێم ئێستا دەبێ کارێکی وابکەین بێچووە قەلەرەشەکە نەمرێ.

یاشار وتی: ـ پاش نیوەڕۆ من ناچمە قوتابخانە، بەدزیەوە دەچین بێچووە قەلەرەشەکە دەر دەهێنین.

نیوەڕۆ، نان و پەنیر و سەوزەیان خوارد. پاش نانی نیوەڕۆ، دایکی یەشار بەدوای ئیشی خۆیدا ڕۆیشت و لەگەڵ منداڵە شیرەخۆرەکەیدا خەوت.

یەشار وتی: ـ من و ئولدوز نانووین. من دەبێ دەرسەکانم ڕەوان بکەم.

ناوناوە یەشار ئەم درۆیانە بیشی دەکرد تا دایکی بەتەنیا جێ ی هێڵێ.

*** کوشتن لەپێناوی ئازادکردنی**
**بێچووە قەلەرەش لەزیندان دا.**

پاش کەمێ، هەردوکیان هاتنە دەرەوە بەپەیژە هەڵگەڕان و چوونە سەربان سەیرێکی ئەم بەرو ئەوبەرو ئەوبەریان کرد، بینیان سەگەرەشیان بەرەڵاکردوە، هاتووە لەناو دەرگای هێلانەی قەلەرەشەوە پاڵ کەوتووەو لێ ی نووستووە.

یەشار وتی: ـ دەچینە خوارەوە، قەلەرەشۆکەکە دەهێنیم.

ئولدوز وتی: ـ مەگەر نابینی سەگەکە لەناو دەرگادا نووستووە؟

یەشار وتی: ـ ڕاست دەکەی. ئەی قەلەرەشۆکەی بێچارە دەبێ ئێستا لەچ حاڵێك دابێ!

ئولدوز وتی: ـ باوەڕناکەی زۆربترسێ. قەلەرەش ئازانە.

یەشار وتی: ـ ئێستا چی بکەین؟

ئولدوز وتی: ـ بیربکەینەوەو، بەدوای چارەیەکدا بگەڕێین.

یەشار وتی: ـ ئێستا بیرێك دەکەینەوە. ئێستا پلانێك دادەنێین. .
مەنجەڵە سرکەی باوەژن لەگۆشەیەکی سەرباندابوو. باوەژن گاشە بەردی لەدەوری دانابوو تاکو نەکەوێ. یەشار چاوی بەبەردەکان کەوت. لەنکاو وتی: ـ وەرە باسەگەکە بکوژین.

ئولدوز ڕاچلەکی و وتی: ـ بی کوژین؟

یەشار وتی: ـ بەڵێ. گەر بیکوژین هەتاهەتایە لەدەستی ڕزگار دەبیت.

ئولدوز وتی: ـ دەترسم.

یەشار وتی: ـ من دەیکوژم.

ئولدوز وتی: ـ گوناهـ نی یە؟

یەشار وتی: ـ گوناهـ؟ نازانم. من نازانم گوناهـ گوناهـ چی یە. بەڵام هیچ ڕێگایەکی دیکە نیە. ئێمە خراپە لەگەڵ کەسدا ناکەین تا گوناهـ بێ.

ئولدوز وتی: ـ سەگەکە هی مامەمە.

یەشار وتی: ـ باشە، منامت بۆچی سەگەکەی هێناوەو لێرەدا بەستوویەتیەوە تا تۆ بترسێنێ و بێچووە قەلەرەشەکە بەندبکا، ها؟

ئولدوز وەڵامی نەبوو بیداتەوە. یەشار بەپێ دزە ڕۆیشت بەردێکی گەورەی هەڵگرتەوەو هێنای، بە ئولدوزی ووت: کەستان لەماڵەوەیە؟

ئولدوز وتی: ـ دایکم بۆ داوەت چووە. نازانم باوکیشم بۆکوێ چووە. من دڵم بەسەگەکە دەسوتێ.

یەشار وتی: ـ وادەزانی من کەیفم بەسەگ کوشتن دێ؟ ڕێگایەکی ترمان نیە.

پاشدان پێ پلیکانەیەك هاتە خوار، گەیشتە سەرسەری سەگەکە. ئەوساکە بەردەکەی بەرزکردەوە بەیەکجار پێ ی دادا. بەردەکە کەوتەسەر سەگەکە. سەگەکە قوڕە قوڕێکی کزی لێوەهات و دەستی بە دەست وپێ کوتان کرد. لەنکاوێك دەنگی باوکی ئولدوز هات. ئەمان خۆیان کشاندە دواوە. باوکی ئولدوز هاتە دەرەوەو بینی سەگەکە خەریکەگیان دەدا.

یەشار لەبن گوێ ی ئولدوزدا وتی: وەرە بۆی دەرچین. ئێستا باوکت بەردەکە دەبینێ و دێتە سەربان.

ئولدوز وتی: ـ قەلەرەشۆکە بەرەڵاکەین؟

یەشار وتی: ـ پاشدان من بەسۆراغی دادێم.

هەردوکیان لەسەرەخۆ چوونە خوارەوەو لەژوورەوە دا نیشتن. کتێبەکانی یەشاریان لەبەردەمی خۆیاندا رووکرد. بەشێوەیەك کە هەر کەسێك بی دیتبان وای دەزانی دەرس ئامادەدەکەن. بەڵام دڵیان تەپ تەپ لێ ی دەدا. ڕەنگیشیان پەڕی بوو.

تەپەتەپی پێ ی باوکی لەسەربانە وەهات. پاشدان بێ دەنگ بوو. یەشار بەتەنیا چووەسەربان. باوکی ئولدوز جلی لەبەرکردبوو لەتەنیشت لاشەی سەگەکە ڕاوەستابوو. پاشدان ڕۆیشت و چووە کۆڵان. یەشار بەبیری هاتەوە کە ڕۆژێك بەردی هاویشتبو، شوشەی پەنجەرەی ماڵی ئولدوزی شکاند بوو. باوکی ئولدوز وەك ئێستا هاتبووە کۆڵان. هەڵاو قیرەقیری نابۆوەو پۆلیسی هێنابوو. کە ئەوەی بەبیرهاتەوە بەخێرایی هاتە خوارەوە، بێچووە قەلەرەشۆکەی دەرهێناو وتی: ـ من یەشارم. سەگەکەم کوشت. سەگەکەم کوشت تاتۆ ئازاد بی.

بێچوە قەلەرەشەکە وتی: ـ سوپاست دەکەم. بەڵام ئیترکات بەسەرچووە.

یەشار وتی: ـ بۆچی؟

بێچووە قەلەرەشەکە وتی: ـ بڕیاری دایکم تا نیوەڕۆی ئیمرۆ بوو. ئەوکاتەش بەسەرچوو، من هێندەم برسی یەتی کێشاوە کەتوانای فرینم نیە.

یەشار خەمگین بوو. هێندەی نەمابوو بگریەت. وتی: ـ ئێستا نایەی فێرە فرینت بکەم؟

قەلەرەشۆکە وتی: ـ وتم وەختێ تێپەریوە. بە ئولدوز بڵێ چەند پەرەموچێکم هەڵکەنێ و هەڵی گرێ، هەرچۆنێ بێ قەلەرەشەکان

بەسۆراغی من و ئێوەدا دێن.

قەلەرەشکوکە ئەمەی وت و دەنوکی پێك داداو لەشی سارد بوو. یەشار گریا. لەناکاو بیرێکی بەمێشکدا هات. چاوەکانی لە شەیتانۆکەدا کسکەی هات. پێکەنی و لاشەی مرداری بێچووە قەلەرەشەکەی لەسەر قادرمە دانا، بەردەکەی هەڵگرت و بردیە موبەق، لاشەی سەگەکەی لەژێر دار توەکەوەدانا ستڵێك ئاوی هێنا، خوێنی ناودەرگاو پێچکەی قادرمەکەی شوشت، سەتڵەکەی سەرەوژێر لەناوەراستی ژورەوە دانا. ئینجا بێچووە قەلەرەشەکەی هەڵگرت و رۆیشت. لەسەربان بەبیری هاتەوە کەنابێ شوێن پێ لەدوای خۆی جێ بهێڵێ ئەمەیشی جێ بەجێ کرد.

ئولدوز زۆر خەمبار بوو. زۆریش گریا. بەڵام ئیتر کارێك بوو رووی وابوو چارەی نەبوو. یەشار دڵنەوایی کردو وتی: ـ ئەگەر دەتەوێ کار خراپتر نەبێ، دەبێ دەنگت لێوە نەیە، کەس هەستت پێ نەکا.

ئیمرۆ زۆرشت لە مامۆستا فێر بوومەو دەمەوێ باوك و باوژنت ئەوەندە بترسێنم کە هەتا لە سیبەری خۆشیان برەونەوە. پاشدان هەرچی یەکی کردبوو و هەرچیەکی بێچووە قەلەکە پێی وتبوو، هەمووی بۆ ئولدوز گێرایەوە. ئینجا ئولدوز نەختێ هاتەوە سەرەخۆ. چەند پەرەموچێکی قەلەرەشۆکەکەی هەڵکەندو لەباخەڵی دانا. یەشار لاشەکەی بردو لە جێگایەك شاردیەوە تا دوایی بەخاکی بسپێرێ.

دایکی یەشار منداڵەکەی لەباوەش کردبوو نووستبوو.

*** منداڵە ژیرەکان.**

دایك و باوکە ناتێگەیشتووەکان دەست خەرۆدەکەن منداڵەکان بەچاوەروانی یەوە دانیشتبون. لەناکاو دەنگە و هەرا بەرز بۆوە. باوکی ئولدوز دادو هاواری بوو. دەنگێکی تریش دەهات. دایکی یەشار لەخەو راپەری و بۆ حەوشە رای کرد. پاشدان گەرایەوەو چارۆکی بەسەر خۆیداکردو چووە سەربان. باوکی ئولدوز وەك شێتی لێهاتبوو. لەسەری خۆی دەداو هاواری دەکرد وای ماڵی وێرانم... چارە رەش خۆم! «لەمەچێتر» بە ماڵەکەم وەربوون! ئیترمن ناتوانم لێرە دانیشم! جنۆکە هاتونە ماڵەکەم... بگەنە هاوارم...

پۆلیس و چەند کەسێکی تر چواردەوریان دابوو ودەیانە ویست هێمنی کەنەوە. باوکی ئولدوز لاشەی توپیوی سەگەکەی نیشان دەدان و هاواری دەکرد. سەیرکەن، ئەمەیانی هێناوەو لێرەی فرێداوە؟ کێ بەردەکەی هەڵگرتووەو بردویەتی؟ کێ خوێنەکەی شوشتوە؟... دێوەزمە بەماڵەکەم فێربوون!.. یەکەمجار سەگەکەیان کوشتوە جارێکی تر... وەی هاوار بەماڵم!... وەی!

ئولدوز یەشار لەسەر قادرمە دا راوەستابوو، گوێیان دەگرت. دایکی یەشار نەی‌دەهێشت بچنە سەربان. بەتیلەی چاو سەیری یەکتریان دەکردو لە دڵی خۆیاندا بە نادانی باوکەو خەڵکەکەی تر پێدەکەنین. خۆشحاڵ بوون بەوەی کەوا ئەم هەموو خەڵکە خۆش باوەڕەیان دەست خەرۆ کردوە. باوکەیان بە پاڵ پێوەڤان بۆژ ووربرد. بەڵام لەناکاودا هاواری ترس لەهەموویاندا بەرز بۆوە: وا.. ی، پەنا بەخوا!.. دێوەزمە!..

باوکە دوبارە بۆ حەوشە رای‌کردەوەو وەکوشێت دەستی بەهات و هاوارکرد چونە ئەم بەرو ئەوبەر سەتڵە سەرەوژێرکراوەکە سەری هەموبانی سورمانەبوو. پیرەمێردێك وتی: دێوەزمە بە ماڵەکەت فێربوونە. دەرگاپێوەدەن. بایەکێك بەدوای جنۆکە گریچێ. یەکێك بچێ نووشتوکەر بانگ بکا. باوکە هاواری‌کرد. یارمەتیم دەن!.. ماڵ وێران بووم!

یەکێ لـ بەدوای «سەیدقولی جنۆکەگر»دا چوو. یەکێك بەدوای (سەیدمیرزا وەلی نووشتوکەر)دا چوو. پیرەژنێك رای‌کردە ماڵەوە بسمیلایەکی» هێنا تا جنەکان بەدەربێ. بسم یەکە بە خەتی تێکەل وگەورە نوسرابووو لەناو قاپە کۆنێکی گەورەدانرابوو،

دووپیاو قاپەکەیان بەدەستەوە گرت بە «بیسمیلا» کردنەوە کەوتنە گەڕان بەکون و قوژ بنی ماڵەکەدا. لەنکاوێك بەردێکی خوێناوی گەورەیان لە ناوەراستی موبەق دابینی. بەترس و لەرزەوە بەردەکەیان هەڵگرت و هێنابانە حەوشەوە. باوکی ئولدوزکە بەردەکەی بینی، دیسان هاواری‌کردەوە: ـ وەی هاوار! وای.. ئەم بەردەلێرە چی دەکرد؟.. کێ ئەمەی بردوەو لێرەی داناوە! ئاخر من چ گوناهێکم کردوە؟

ئولدوز و یەشار لەسەر دیواردا راوەستا بوون. کە ئەم قسانەیان گوێ لێ بوو، پێکەنین گرتنی. بەخێرایی خۆیان بەژ وردا کردەوەو تا خەڵکە کە نەیانبینێ.

یەشار وتی: ـ لێگەرێ ئێستا با باوەژنیشت بێتەوە، ببینە چ خاکێك بەسەرخۆیدا دەکا. داوەت و زەماوەندی لێ دەبێتە ژەهر.

هەردوکیان لە دڵی خۆیاندا پێکەنین. یەشار دەستی لەسەر دەمی ئولدوز دانا تاکەس گوێی لەدەنگی نەبێ.

کەس نەیزانی کێ خەبەری باوەژنی ئولدوزی دابوو بەخێرایی خۆی گەیاندە ماڵەوە کەمێردەکەی بینی، بورایەوەو لە ناوەراستی حەوشەکەدا کەوت. ژنان بەخشکە خشك بردیانە ماڵە هاوسێ یەکەی دەستەراستەوە پیرەژ ن دەیوت: دەبێ یەکەمجار جنۆکەگرو دوعانوسەکە بێن، جنۆکەکان دەرکەنە دەرەوە، پاشدان ژنە سك پرەکە بچێنە ژوورەوە.

مەخلەس، سەرتان نەیە شێنم، پاش نیوسەعات جنۆکە گرو دوعا نووسەکە هاتن. جنۆکەگر تەشتێکی سەراوژێری لەپێش دانا، قسەی سەیروسەمەرەی کرد. داوای ئاوێنەی‌کرد، دەنگی عەجیب و غەریبی لەخۆی و تەشتەکەوە بەرزدەکردەوەو لەدوایی دا ووتی: ـ ئەی دێوەزمەکان، ئێوە بەپاشا هەموو «دێوەزمەکان» سوێند دەدەم لەماڵی ئەم پیاوە موسڵمانە دورکەونەوە، ئازاری مەدەن!

پاشدان گوێی بۆ دەنگی زنگوڵە شل کردو بەئاوێنەو باوکی ئولدوزی وت: ـ پەنجا تومەنم بدەیە، تاوابکەم رێگا بگرنەبەرو برۆن.

باوکی ئولدوز مامەڵەی‌کردو سی تومانی دایە. جنۆکە گرەکە پارەکەی وەرگرت، دەستی بۆژێر تەشتەکە بردو دەری‌هێنا. ئەووەختە دووبارە وتی: ـ ئەی «هەمەچێترەکان». لەماڵی ئەم پیاوە موسڵمانە دوور کەوتەوە، ئازاری مەدەن! بەپاشای جنۆکان سوێندتان دەدەم! پاش کەمێك هەڵساو

بەپێکەنینەوە بەباوکی ئولدوزی وت :
خۆشبەختانە دەستیان لێت هەڵگرت و زوورۆیشت . ئیتر ناگەرێنەوە بەممەرجێك من رازی کەی .
باوکە هەناسەیەکی بەخۆشی هەڵکێشا ، سی تومانی تری دایە جنۆکە گیرەکەو ملی رێی گرت و رۆیشت . نۆرەی نوشتوکەرەکە بوو . بەختەتی خواروخێچ ، بەمەرەکەبی ، رەش و نارنجی چەندشتێکی نووسی ، هەرپارچە کاغەزێکی لەقوژنێکی ماڵەکەدانا ، بیست تومانی وەرگرت و رۆیشت .
باوەژنەکەیان هێنایەوە .
کەس نەیزانی کە پۆلیس کەی لێی داوەو رۆیشتوون .
کەشەوداهات . دایکی یەشار ئولدوزی بۆماڵی خۆیان بردەوە . باوکی ئولدوزو ژنەکەی هێندە دەستەپاچەو ترسابوو کە تا ئەووەختە ئولدوزیان بەبیرنەکەوتبۆوە .

*** بەفر ، سەرما ، بێکاری و چاوروانی .**

پایز داهات ، بەفرو سەرمایشی لەگەڵ خۆیدا هێنا . پاشدان زستان داهات ، بەفرو سەرما لەرادە دەرچوو . مامی ئولدوز بەسەرو سۆراغی سەگەکەی داهات ، بەتورەیی و دەستی بەتاڵەوە گەرایەوە . لەسەر سەگەکە شەرو دەعوایشیان بوو .
باوەژن ئێستاترسی نەرەوی بۆوە . دەرودیواری مویەق پربوو لە نوشتوی دوعانامەی چاپکراو نووسراو . شەوان دەترسا بەتەنیا بچێتە دەرەوە . ئولدوزی لەگەڵ خۆیدا دەبرد . ئولدوز تۆزقاڵێك ترسی نەبوو . بەتەنیا دەچووەدەرەوەو لەدڵی خۆیدا بەباوەژنی پێدەکەنی . پەرەموچەکانی بێچووەو قەلەرەشەکەی لەناو بەرگی رادێودا حەشاردابوو . یەشاری زۆرکەم دەبینی یەشار لاشەمردار قەلەرەشکۆکەکەی لەشوێنێکی باش ناشتبوو . بە رێك وپێکی دەچووە قوتابخانەو دەرزەکانی دەخوێند .
بەڵام ناوناوە لەسەر لاستیك ون کردن لەگەڵ دایکی دا شەری دەکرد . یەشار لاستیکی زۆر ون دەکردو دایکیشی تورەدەبوو دەیوت : ـ دەڵێی تۆنازانی ، باوکت بەهەزار دەردەسەری پارەی ئەم لاستیکە بەدەست دەهێنێ .
سکی باوەژنی زۆرگەورەببوو . ژنەکانی هاوسێیان پێیان دەوت : ـ یەك دوو هەفتەی تر منداڵت دەبێ .
باوەژن وەڵامی دەدانەوەو دەیوت : ـ رەنگە زوتر منداڵم ببێ .
ژنە هاوسێکانیان پێیان وت : ـ ئینشائەڵلا ئەنجارەیان بۆت دەژ یە .
باوەژن دەیوت : ـ ئینشائەڵلا ! خێرلەخۆم بگرم هەردەژ یە .
باوکی یەشار زۆربەی کات بێکاربوو . نەدەچووە ئیش . بەفر ئەوەندە دەباری کە بەیانی هەڵدەستای دەتبینی بەفرتا ناوەراستی پەنجەرەکانی گرتووە . سەرما چۆلەکەکانی ووشك دەکردەووە وەك گەڵای پاینری دەرژان .

رۆژێکیان سەرلەبەیانی باوکی ئولدوز بینی کەدوو قەلەرەش لەسە[illegible]وانەدە هەڵنیشتوون . کوتەکێکی دەست دایە ، هێرشی بردو هەڵی ک[illegible]تایە سەریان ، لێی دان ، هەردوکیان کەوتن . بەڵام کاتێ کەدەستی بۆبردن بەدیارکەوت کەلەسەرمان ووشك بوونەتەوە .
ئولدوز زۆر دڵگیربوو . یەشار پاش چەند رۆژێك ئەم خەبەرەی لەدایکی بیست . لەبەر خۆیەوە وتی : ـ ناکا بەدوای بێچووە قەلەکەدا هاتبن ! ئەی باڵندە بەستەزمانەکان !
دایکی یەشار هەموو بەیانیەك دەهات یارمەتی باوەژنی ئولدوزی دەدا . قاپ و قاچانچەکانی دەشوشت ، ماڵەکەی خاوێن دەکردەوە وەختی نیوەرۆ بۆماڵی خۆیان دەچۆوە . ئولدوز ئەوی خۆشدەویست . ژنێکی خراپ نەدەهاتە بەرچاو کاتێك باوەژن دەرۆیشت ئولدوز دەیتوانی چەند قسەیەکی لەگەڵدابکا . لەتەندروستی یەشار بپرسێ و سەلامی بۆ بنێرێ . هاوسێیەکانی تریش دەهاتن و دەچوون ، بەڵام ئولدوز دایکی یەشاری لەهەموان زیاتر خۆشدەویست . لەبەرئەوەی لەپێش ئەودا هیچی بەدیارنەدەخست . بەتاك و تەنیا چاوەرێی قەلە رەشەکانی دەکرد . دڵنیابوو کە قەلەرەشەکان رۆژێك هەردێن .
باوکی ئولدوز وەك هەمیشە دەچووە دایەرەو بۆماڵ دەگەرایەوە شەوێك بەباوەژنی ئولدوزی وت : ـ من حەز لە منداڵ دەکەم . ئەگەر ئەمجارەیان منداڵەکەت بژ یەت و بەسەر پێ کەوێ ، ئولدوز بۆجێگایەکی تردەنێرم تا تۆ بحەسێیتەوە . بەڵام گەر دیسان منداڵەکەت بەمردویی بێتەدنیا ، ئیتر ناتوانم ئولدوز لەخۆم دوورکەمەوە باوەژن ئومێدەواربوو کە منداڵەکەی بەزیندویی ببێ ،
بۆئەمە گەڵی نەزرو نیازی لەخۆی گرتبوو . ئولدوز ئیرەیی و حەسودی بەو منداڵەی ئێستاکە نەبووە دەبرد . حەزی دەکرد بەمردویی لەدایك بێ .

**نەزرو نیاز بەری مەرگ ناگرێ .**
**یادێك لەپورقەلەرەشەوە .**

لەئەنجامدا باوەژن منداڵی بوو . منداڵەکە زیندوبوو . جادویان کرد . خێروقوربانیان لەخۆیان گرت . نوشتوو سیمریان وەرگرت نەزورنیان کرد . مۆم وەرەوزەی عەلی ئەسفەرو ئەم وئەویان نەزرکرد . بۆچی ؟ بۆئەوەی منداڵە نەمرێ . بەڵام پاش هەفتەیەك منداڵە قوربانی حازریان بوومەرگ بۆخۆی بردەوە . پزیشکیان هێنا ، وتی : ـ لەناوسکی دایکی باش نەگەیشتبوو ، بەسەختی دەیتوانی بژ یەت . من ناتوانم کارێکی بۆبکەم .
بۆبەیانی منداڵەمرد .
باوەژن لە لاوازی و خەمانەدا زۆر خراپ نەخۆش بوو . شەوورۆژ دەیوت : دێوەزمە منداڵەکەمیان حنکاند ، ئێستا کە دەستیان لێمان هەڵنەگرتووە . زۆر هەسودو چاوپیسن ، حەسودیان پێ بردین و چاویان لێ داین و منداڵەکەمیان کوشت .
دایکی یەشار بەدرێژایی رۆژ لەلای باوەژنە دەمایەوە . یەشاریش بۆ

فراوین خواردن دەهاتەلای دایکی و چەند قسەیەکیشی لەگەڵ ئولدوزدا دەکرد. هیچ دەنگوباسی قەلەرەشەکان نەبوو. تەنیا ناوناوە قەلەرەشێك تەنیا بەئاسماندا تێدەپەری و یان دەنگی قرەقری دەهاتەگوێ و زوو دەدما.

دارتەوریزی یەکان رووت وخالی مابوونەوە. ئولدوز دەکەوتە یادی پورە قەلەرەشەوەکە بەچ جۆرێك لەسەر لقە ناسکەکانی دا دەنیشت، قرەقری دەکرد، باڵەفرەی دەکرد، لەنکاوێك لەشەقەی باڵی دەداو دەفری.

*** زستان سەخت و توش تێپەر دەبێ.**

زستان بەسەختی تێدەپەری. زۆرسەخت، هەرلەزووەوە بەفر لەناو حەوشەدا بەبڵندی دیوارەکانداکەوتەسەریەك. بەر ئاگرخۆش بوو نەوت گران بوو. بەسێ قاتی نرخی خۆیشی دەست نەدەکەوت. باوکی یەشار هەمیشە بێکاربوو. دایکی بۆکارکردن وجل شۆری دەچوو ماڵانی تر. ناوناوە خەبەری سەیری بەمێشك دا نەچووی دەهێنایەوە. بۆنموونە دیووت: - دوێنی شەوخێزانێکی هەژار لەسەرما وشك بوونەتەوە. رۆژیکیشیان بەیانی زووهات بەباوەژنی وت: - شەومنداڵەکەم لەژێر چارپایە داوشك بۆتەوەو مردوە.

یەشار زۆر پەژمردە بوو. بیری مردنی خوشکە. بچوکەکەی ئەوی شتێت کردبوو. لەلای ئولدوز گریاو وتی: - هێندەی نەمابوو منیش لەسەرمان رەق ببمەوە. ئاخر ژوورەکەمان زوربەی کات ئاگرپشکۆی ساردە، ئاگروپشکوی تێدانیە ئولدوز فرمێسکەکانی سریەوەو وتی: - یەشار مەگری، دەنامنیش دەگریەم.

یەشار ژیربووەوەو وتی: - بەیانی باوکم بەدایکمی دەوت کە لەم وێرانەیەدا کەس نیەبڵێ کە بۆچی فلان و فیسار دەبێ ئاگریان نەبێ.

ئولدوز وتی: - باوکت ئیش دەکا؟

یەشار وتی: - نا هەموو کات لەماڵ دادەنیشێ و بیردەکاتەوە. جار جارەش دەچێتە بەفر ماڵین.

ئولدوز وتی: - بۆچی ناچێت کارێك بدۆزێتەوە؟

یەشار وتی: - دەکێ ئیش نیە.

ئولدوز وتی: - بۆچی ئیش وکار نیە؟ یەشار هیچی نەوت.

*** بونی بەهار.**

بەفر تەنك بووو کەمتر بۆوە. بەهار خۆنیشانداو ئاوەکان ژ یانەوە چیمەن سەوزبوو. گوڵ وگوڵزار زۆر بوو. زستان زۆر کەسی شەکەت و پایەماڵ کردبوو. زۆر کەسیش بەسەر سەختی و قوربەسەری مابوون.

دایکی ئولدوز تەختی نوستنی پێچایەوە. پەنجەرەی کردەوە باوکی یەشار لەگەڵ پانزەبیست کەسێکی دیکە چووە تاران. چووتاکو کورەکانی لە خشت دروست کردندا کاربکا. یەشارو دایکی لەماڵەوەدا تەنیا مانەوە. وەکو ساڵانی تر.

باوەژ ن تازە چاك ببۆوە. چاوی بەرایی نەدەدا سەیری ئولدوز بکا ئولدوز زۆربەی کات لەماڵی یەشار بوو. باوەژنیش هیچی نەدەوت.

باوکە دڵی بە ئولدوز دەدا بەڵام ئولدوز رقی لەویش دەبۆوە. باوکی ئولدوز دەیووت: ئیمساڵ بۆ قوتابخانەت دەنێرم.

*** چ کەسێك**

*** زمانی قەلەرەش دەزانێ؟**

مانگی خوردار هات یەشار سەرگەرمی بەرێکردنی تاقی کردنەوەکانی سەری ساڵ بوو. رۆژێك بەئولدوزی وت: دوێنێ دووقەلەرەشم بینی لەدەوروبەری قوتابخانە بەئاسماندا دەخولانەوە. ئولدوز لەشوێنی خۆی راپەری و وتی: - باشە، ئەی پاشدان؟

یەشار وتی: - پاشدان من چومە پۆل. تاقی کردنەوەی حیسابم هەبوو. کاتێ کە هاتمە دەرەوە، بینیم نەماون.

ئولدوز لەسەرەخۆ لەشوێنی خۆیدا نیشتەوە. یەشار وتی: - خەم مەخۆ، ئەگەر قەلەلەشەکانی ئێمە بوون، دەگەرێنەوە.

ئولدوز وتی: - قسەت لەگەڵدا کرد؟

یەشار وتی: - ماوەنەبوو، من ئێستاکە زمانی قەلەرەشان نازانم.

ئولدوز وتی: - هەر دەزانی؟

یەشار وتی: - تۆ دەزانی؟

ئولدوز وتی: - لەبەر ئەوەی میهرەبانی، لەبەر ئەوەی دڵێکی پاکت هەیە، لەبەر ئەوەی خۆپەرستنی و هەموو شتێکت هەر بۆخۆت ناوێ، لەبەر ئەوەی وەك باوەژنم نیت.

یەشار وتی: - ئەوانە لەکوێ فێر بویتە؟

ئولدوز وتی: - هەموو منداڵێکی باش زمانی قەلەرەشەکان دەزانن پور قەلەرەش دەیووت. من قسە لەخۆم وە دەر ناهێنم.

یەشار بەم خەبەرە گەڵێ شادبوو. لەخۆشیان دەستی ئولدوزی لەناو هەردوو دەستیەوە گرت و رای گوشی: نازانم چۆن بوو ئەورۆژە توانیم لەگەڵ بێچووە قەلەرەشەکەدا قسەبکەم. هەر لەبیرم نیە.

*** گەرانەوەی قەلەرەشەکان.**

دوسێ رۆژ بەسەرچوو. هاوین نزیك دەبۆوە. هەوا گەرم دەبوو زەلامی گەورە پاش نیوەرۆیان ئارەزوی نوستنیان دەکرد. کەنانی نیوەرۆیان دەخواردو دەنووستن. منداڵەکانیشیان بەزۆری دەنواند. رۆژێکیان یەشار دوا ئیمتیحانی دابوو بەرەوماڵەوە دەگەرایەوە. کەمێك لە خوار قوتابخانەوە مزگەوتێکی لێبوو. لەبەردەم مزگەوتەکە دارتووەکیان ناشتبوو. لەناو دارەکەوە دەنگێك هات ناوی یەشاری هێنا. سەر لە نیوە رۆبوو. یەشار گەرایەوە، سەیری دەوروبەری کرد، کەسێکی نەبینی. کۆڵان چۆل بوو. ویستی ملی رێگا بگرێتەوە کە دووبارە لە پشتیەوە بانگیان کرد: - یەشار!

یەشار گەراوە دواوە. لەنکاو چاوی بەدوو قەلەرەش کەوت کە لەسەر دار تودا نیشتبوون، پێدەکەنین. دڵی یەشار کەوتە تەپە تەپ و وتی: - قەلەرەشینە ئێوە من لە کوێ دەناسن؟

قەلەرەشێك بەدەنگێکی ناسکەوە وتی: - کاکە یەشار، تۆ برادەری ئولدوز نیت؟

یەشار وتی : ـ بەڵی ، بۆ ، برادەریم .

قەلـەرەشـەکـەی تر بەدەنگێکی نێرەوە وتی : ـ زۆر باشە دایکمان تۆی نەبینی بوو، بەلاّم ئولـدوز نیشـانەکانی تۆی بۆدایکم هەڵدابوو . لەمێژ بە قوتابخانەکاندا دەگەڕێیینم تا بتدۆزینەوە نەمان وویست یەکەم جار ئولدوز ببینین . دایە گەورەمان باسی حاڵی ئولدوزی بۆ کردبوین کە چۆنە؟

یەشار وتی : ـ قەلەرەشەکان دەترسێ کە فەرامۆشتان کردبێ .

قەلـەرەش بەدەنـگـێـکـی نێـرەوە وتی : ـ ببـەخشـە ، ئێمـە خۆن پێ نـەنـاسـاندی : ـ من برای ئەو قەلەرەشەم کەلە لەلای ئێوە بووو پاشدان مرد، ئەممەشیان خوشکمە . بەوە بڵێ قەلەرەش خان .

قەلـەرەشمـان وتی : ـ هەڵبـەتە ئێمە برایەکی تریشمان هەبوو سەرمای زستان رەقی کردەوەو مرد، باوکیشمان خەم ی بۆ مردنی دایکمان خوارد .

یەشار وتی : ـ سەری ئێوە سەلامەت بێ ، بۆ خۆتان خۆش بن .

قەلەرەشەکان و تیان : ـ سوپاست دەکەین .

یەشار بیرێکی کردەوەو وتی : ـ باش نیە لێرە قسە بکەین ، بابچینە ماڵی ئێمە ، کەس لە ماڵ نیە .

قەلـەرەشـەکـان قبـوڵیـان کرد . یەشـار ڕێی کـردو قەلەرەشـەکانیش لە سەرسەریەوە بەفرین هاتن .

کەس نەیدەزانی کە یەشار لە چ حاڵێك دا بوو . خۆی ئەوەند بە گەورە دەزانـی ، هەر باسـی ناکـرێ . کە سەیـری ئاسمـانی دەکـرد ئاوری لەقـەلەرەشەکان دەدایەوە ، پێ دەکەنی و دوبارە دەکەوتەوە رێگا . لەدوایی دا گەیشتنە ماڵەوە . کلیلی لە هاوسێ یەکان وەرگرت و چووە ژ ورەوە . دایکی نیـوەرۆیـان نەدەهـاتەوە ماڵ . قەلەرەشەکان هاتنە خوارەوە ، لەسەر قادرمە دانیشتن . یەشار وتی : ـ دەتانە وێ ئولدوز ببینن؟

لەهەمان کاتدا دەنگی گریانی ئولدوز لەولاوە بەرز بۆوە .

هەرسێکیـان مات و خامـۆش بوون . پاشـدان قەلەرەشخان وتی : ـ با پەلەنەکەین ، ناتوانینن ئێستاکە ئولدوز ببینین .

کاکـەقـەلـەرەش وتی : ـ بەڵی ، دەبێ برۆین خەبـەر بدەین بە شاری قەلـەرەشـان ، پاشـدان دێینـەوەو دەبینین . هەر ئێـرەوە دێینەوە سەلامی ئێمە بەئولدوز بگەیەنە .

کەیـەشار تەنیا ماوە ، چووەسەربان . هەرچەندی چاوەرێ بوو ، ئولدوز نەهاتە حەوشە . گەڕایەوە . دایکی نان وپەنیری لەناو یەخداندا بۆ دانابوو . فراوینی خوارد ، دیسـان چۆوە سەربـان . هەوا گەرم بوو . کراسـەکـەی دەرهێنـا ، لەسـەر گازەرەی پشت لێی درێـژ بوو . دەیـوویست سەیـری ئاسمان بکا .

ئاسمـان ساف وشین بوو . چەنـد مەلێك لە ئاسمانی سافدا دەفرین . وەك ئەوەی لەسەرەوە بەدێنەخوارەوەو ، باڵ لێك نەدەن .

*** بریاری هەلاّتن**

**هەلاّتن لەپێناوی گەرانەوەدا .**

لەسـەرنانی نیوەرۆدابوو . باوکی ئولدوز ، ئولدوزی لە تەنیشت خۆیەوە دانابوو . چاوەکانی ئولدوز تەربوون . هەنسکی دەداو دەگریا .

باوەژنی دەیووت : ـ حەزی لە دارکاری یە . هەڵلای ناوەتەوە .

باوکی وتی : ـ کچی شیـرنیم ، تۆمنـداڵێکی ژ یروگوێ رایەڵ بووی ، قسەت چیەو چیت دەوێ؟

ئولدوز هیچی نەوت . هەنیسکی دا . باوەژ ن وتی : ـ دەڵی بە تەنیا دڵم تەنگ دەبێ . دەبێ لێم گەرێی بچم لەگەڵ یەشاردا یاری بکەم لەپرێك ئولـدوز وتی : ـ بەڵێ حەزدەکـەم لەگـەڵ هاوڕیاری یەکی خۆمدابم بە تەنیا دیق دەکەم .

پاش کەمێـك دەبێ ونـابێ ، باوکی بریاری دا کە ئولدوز جارجارە بچێتە لای یەشاروزوو بگەرێتەوە . ئولدوز زۆر شادمان بوو . پاش تان خواردنی نیـوەرۆ باوك و باوەژنی نووستن . ئولـدوز هەڵسا ، چووە سەربان . حەزی دەکرد لەوێ دانیشێ و چاوەرێی قەلەرەشەکان بکا . لەپرێك دا چاوی بە یەشـار کەوت زۆر رحـەت و سیحـەت لەشیرنی نووستبوو . هاو گەرم بوو . ئولـدوز چوو لەپشت سەری یەشـارەوە دانیشت . دەستی بە قژی داهێنا . یەشـار چاوەکـانی هەڵێنـا . پێکـەنی . ئولدوزیش پێکەنی . یەشار هەڵسـا دانیشت . کراسی لەبەرکردەوەو وتی : ـ ئولدوز، دەزانی لە خەودا چیم دەبینی؟

ئولدوز وتی : ـ نا ، نازانم .

یەشـار وتی : ـ لە خەونمـدا دەستی یەکتـریمـان گرتبـوو ، لەسەر پەڵە هەوران دانیشبـوین ، دەچـوونیـە داوەت و زەمـاوەنـدی قەلـەرەش خان ، قەلەرەشی دیکەشمان بەدوا دادەهات .

ئولدوز نەختێ سورهەڵگەرا . پاشدان وتی : ـ ئەدی قەلەرەش خانو کێ یە؟

یەشار وتی : ـ پێم نەوتیت؟

ئولدوز وتی : ـ نا .

یەشار وتی : ـ قەلەرەشەکانم بینی . قسەشم لەگەڵدا کردن .

ئولدوز وتی : ـ کەی؟

یەشار وتی : ـ وەختی لە قوتابخانە دەگەرامەوە . خوشك و برای بێچووە قەلەرەشەکە بوون . بریار وایە ئێستا بێنەوە .

ئولدوز وتی : ـ کە واتێ قەلەخان خوشکی بێچووە قەلەکەی خۆمانە؟

یەشار وتی : ـ بەڵێ .

ئولدوز وتی : ـ مامە قەلرەش خەبەری چی یە؟

یەشار وتی : ـ دەیانوت لە خەمی ژنەکەیدا مرد .

لە هەمـان کاتـدا دوو قەلەرەشەکە لە پەنا درەختەکانەوە بەدیار کەوتن . هاتن هاتن . گەیشتنە سەربان نیشتـن . سلاّویان کرد . ئولدوز یەکێکیانی گرت و ماچی کردو لە ناو کۆشی نا . پاش هەواڵ پرسین و چۆنی و چاکی ، کاکـە قەلـەرەش وتی : ـ ئولدوز ، هەموو قەلەرەشەکان دەڵێن دەبێ تۆ بێیتە لای ئێمە .

ئولدوز وتی : ـ یەعنی لەم ماڵە راکەم؟

کاکـە قەلـەرەش وتی : ـ بەڵێ دەبێ راکەی و بۆلای ئێمە بێ ی . ئەگەر

لێرەدا بمێنیتەوە دیق دەکەی و دەمری. ئێمە دەزانین کەباوەژ ن زۆر ئازارت دەدا.

ئولــدوز وتـی : ـ چۆن دەتـوانـم هەڵێم؟ باوکم وباوەژ ن نایــەڵن. مامیشم، لەوکاتەوە سەگەکەی کوژ راوە، پێی لە ماڵی ئێمە نانێ.

قەلـەرەش خان وتی : ـ ئەگـەر تۆ حەزبکـەی، قەلـەرەشـەکان دەزاتن چۆنت دەربازدەکەن.

یەشـار تا ئیتـروکـانـە هیچی نەوتبوو. لەم وەختەدا وتی : یەعنی بڕواو ئیدی نەگەڕێتەوە؟

قەلەخان وتی : ـ ئەمە لەسەر ئارەزوی خۆیەوە دەوەستێ. ئەدی تۆ چی دەڵێی، یەشار؟

یەشـار وتی : ـ بڕیـار لە سەر قسـەکـانتـان دەدەم وبەدڵمـە. گەر لێـرە بمێنێتەوە لە دەست دەچێ و ناتوانی هیچییش بکا. بەڵام گەر بچێتە شاری قەلەرەشان. من نازانم چۆن دەبێ.

کاکەقەلەرەش وتی : ـ پەیانیش دێینەوە دووبارە قسەی لێ دەکەینەوە.

ئولدوز تۆش تا بەیانی بیرێك بکەوە..

قەلەرەشەکان ڕۆیشتن، ئولدوز وتی : ـ بەڕای تۆ من دەبێ بڕۆم؟

یەشار وتی : ـ بەڵێ برۆ. بەڵام بگەڕێوە. بەڵێن دەدەی کە بگەڕێیەوە؟

ئولدوز وتی : ـ یەشار، پەیمان دەدەم، دەگەڕێمەوە!

*** داپیرە دەنگە و ڕێی.**

**هەڵاتن دادەنێ**

سبـەێنی کاتی نیوە ڕۆ قەلەرەشەکان هاتنەوە. پیرە قەلێکیشیان لەگەڵدا بوو. قەلـەرەش خان وتی : ـ ئەمەش دایەگەورەیە دایەگەورە چوە باوەشی ئولــدوزو یەشــارەوە، پاشــدان بەرانبـەریـان دانیشت ووتی : ـ هەمـو قەلـەرەشـەکان خۆشحاڵن بەوەی ئێوەمان دۆزیەوە. کچەکەم زۆر باسی ئێوەی دەکرد.

ئولدوز وتی : ـ پورقەلەرەش کچی ئێوە بوو؟

نەنە وتی : ـ بەڵێ قەلەرەشێکی باش بوو.

ئولدوز ئاخێکی هەڵکێشا ووتی : ـ لەسەر من کوژ را.

نەنـەپیـرە وتی : ـ قەلـەرەش یەك دووێك نین. بە مردن و کوشتن تەواو نابن. ئەگەر یەکێك بمرێ، دوان دێنە دنیاوە.

یەشار وتی : ـ ئولدوز حەزدەکا بێنەکن ئێوە.

داپیرە وتی : ـ زۆر باشە! کەواتە دەبێ دەست بە ئیشەکەمان بکەین.

ئولدوز وتی : ـ هەر وەختێك ئارەزوم کرد دەتوانم بگەڕێمەوە؟

داپیــرە وتی : ـ حەتمـــەن دەتـوانی بیگـەڕێیەوە. ئێمـەی قەلـەرەش حەزنـاکـەین هیـچ کەسێك ماڵ وژیان ودۆستی خۆی جێ بهێڵێ و هەڵێ خۆی بە ئاسودەیی بژیەت و ئاگای لە خەڵکی دیکەوە نەبێ.

ئولدوز وتی : ـ چون و پەچی من دەبەنە لای خۆتان؟

دایـە گەورە وتی : ـ پێش هەمـو شتێـك ئاجەتمان بە تۆڕێکی تۆکمەو قایمە. ئەمە دەبێ خۆتان بی چنن.

ئولدوز وتی : ـ تۆڕ چ دادمان دەدا؟

دایـە گەورە وتی : ـ سودی یەکـەمی ئەوەیە قەلەرەشەکان دڵنیا دەبن کە ئێـوە تەمـەڵ و تەوەزەل و بێکـارە نین و ئامـادەن لە بۆ خۆشبـەختی خۆتـان زەحـمـەت بکـێشـن. سودی دوەمی ئەوەیــە کە تۆ لە ناوی دادەنیشی و قەلەرەشەکانیش تۆر بەرز دەکەنەوە ئاسمان و دەتبەنە شاری خۆیان.

یەشار لەگەرمەی قسـەکاندا ڕای کردو وتی : ـ داپیرە یبورە ئێمە داوەدەزو خوری لەکوێ بێنین تاتۆر بچینین؟

داپیرە وتی : ـ قەلەرەشەکان هەمیشە ئامادەن خزمەت و ئیش لە پێناوی مرۆڤی باشدا بکەن، ئێمە ریس دەهێنین، ئێوەش پێکەوە دەیرێسـن و تۆ دەچنن.

چەنــد گاشــە بەردێکی گەورە لە سەربــانـدا بوو. باوەژ ن ئەوانـەی لەدەوری سرکـەدا کەڵـەك دەکرد. داپیرە وتی : ـ ئێمە خوری دەبینین و لە ناوەڕاستی ئەوانەدا کۆی دەکەینەوە.

کەمێکیش لەملاو ئەولادا قسەیان کرد، پاشدان قەلەرەشەکان ڕۆیشتن.

ئولدوز وتی : ـ من نازانم چۆن خوری بڕێسم و تۆر بچنم.

*** یەشار وتی : ـ من بەلەدم، لە باوکم فێر بوومە.**

*** قەلەرەشەکان هەوڵ دەدەن**

*** منداڵەکان بەدڵ وگیان تێدەکۆشن.**

*** کاروبار بەرەوپێش دەچێ.**

قوتابخانەی یەشار تەحتیل بوو. ئێستا فێربوونی فارسی یەکەیشی باش بوو. دەیتـوانی نامـەکـانی باوکی بخـوێنێتـەوە، لێکی بداتـەوەو بەدایکی بڵێ. کتێبی دەخوێندەوە، دیسانەوە دێکی دەچووە جل شوشتن. باوکی کە کورەکانی خشت دروست کردنی تەهراندا ئیشی دەکرد. قەلەرەشێکی گەلێ زۆر بە ماڵی ئەواندا هات و چۆیان دەکرد. باوەژ ن لە پرێك سەیری ئاسمانی دەکرد لە بەرزۆری قەلەرەشان ترسی لێدەنیشت. ئولدوز هیچی بە سەر خۆی نەدەهێنـا باوەژ ن لەپـرێـك نارحـەت دەبـو و لەبـەرخـۆیـەوە دەیـوت : ـ ناکـا ئەم کچـە تیـوە سەین و بەنێکی لەگـەڵ قەلـەرەشـاندا هەبێ؟ بەڵام لە ڕوودا ئارام و حەزلوم ئولدوز بەم جۆرە هیچی نیشان نەدەدا!

کاری خوری ریستنەکە لە ماڵی یەشاردا بەرەوپێش دەچوو. یەشار وەك زەلامی گەورە لەسەر پێ ڕادەوەستاو بە تەشی خوری دەرێسی.

ئولـدوز داوەکـانی بەدەست پێکـەوە بادەداو داوی گەورەتـری دروست دەکرد. لە حەوشـەدا کولانەیەکی بچوك هەبوو تەنافەکانیان لەوێدا دەشاردەوە.

داپیــرە ناوەنـاو سەری لێدەدان و لە بارەی چۆنیـەتی کارەوە پرسیـاری دەکـرد. یەشـار خوریـە ریسـراوەکـانی نیشان دەدا دایەگەورە پێدەکەنی و دەیـوت : ـ ئا فەرین منـاڵە ژ یرەکان، ئافەرین! نەبادا یەکێکی تر هەست بکـا کەئێـوە بەنێنی یەوە ئیش دەکەن! چاو لەملاو ئەولاتان بکەن و گوێتان قولاغ کەن.

یەشارو ئولدوز دەیانووت :

دایـەگـەورە. ڕاستە کە تەمەنمان کەمە، بەڵام هۆشمان زۆرە. ئەوەندەش تێدەگەین کە نابێ مرۆڤ هەموو کارێك ئاشکرا کا. هەندێك ئیشەکانیان ئاشکرا ئەنجام دەدەن، هەندێکیش بە نهێنی. دایەگەورە دەنوکە قولاپیەکەی بەخاك دا دەهێناو دەیووت: ـ خۆشم لە ئێوەدێ. جیاوازیتان لەگەڵ دایك و باوکتاندا هەیە. ئافەرین، ئافەرین! بەڵام ئێستا منداڵن و قاڵ نەبوونەوە. دەبێ گەلێ شت فێربن و لەوە باشتر بیربکەنەوە.

ناوتاوەش قەلەرەش خان و براکەی دەهاتن، لە کنیان دادەنیشتن قسەیان دەکرد. قسەیان لە بارەی شاری خۆیانەوە دەکرد. قسەیان لە بارەی دارتەورێزیەکانەوە دەکرد. باسی هەوروبا، چیا، دەشت و چۆڵی و گۆماوەکانیان دەکرد.

ئولدوزو یەشار برادەرایەتیان لەگەڵ پەنجا شەست قەلەرەشی تریشەوە پەیداکردبوو.

قەلەخان دەیووت: ـ زیاتر لە ملیۆنێك قەلەرەش بەشاری قەلەرەشاندا دەژی. ئەم قسەیە منداڵەکانی خۆشحاڵ دەکرد چەند باشە! ملیۆنێك قەلەرەش لە جێگایەکدا دەژیەن و دەعواو ناخۆشیشیان نابێ!

*** هاوسەفەری ئولدوز**

ڕۆژێك یەشارو ئولدوز خوریان دەرست. ئولدوز سەری بڵندکرد، بینی یەشار مات وخامۆش، کپ ڕاوەستاوەو سەیری ئەودەکا. وتی: ـ بۆچێ بەم جۆرە تەماشام دەکەی، یەشار؟ چی بووە؟

یەشار وتی: ـ بیرم دەکردەوە؟

ئولدوز وتی: ـ بیرت لەچی دەکردەوە؟

یەشار وتی: ـ هە[illegible]ما بیرم دەکردەوە.

ئولدوز وتی: ـ دەبی پێم بڵێی.

یەشار وتی: ـ باشە، دەبڵێم. خەریکبووم بیرم لەمە دەکردەوە کە ئەگەر تۆ لێرەبرۆیی، [illegible] بەتەن[illegible] دیق دەکەم.

ئولدوز وتی: ـ منیش دوێنی بیرم کردە وە کە خۆزگە پێکەوە سەفەرمان ئەکرد. سەفەرکردن بەتەنیا تامی نیە.

یەشار وتی: ـ کەواتە تۆحەزدەکەی منیش لەگەڵتدا بێم؟

ئولدوز وتی: ـ من لە دڵەوە حەزدەکەم. دەبێ بە داپیرە بڵێن.

یەشار وتی: ـ من خۆم پێی دەڵێم.

ڕۆژی دوایی داپیرە هات. یەشار وتی: ـ داپیرە، منیش دەتوانم لەگەڵ ئولدوزا بێمە لای ئێوە؟

دایـەگـەورە وتی: ـ دەتوانی بێی، بەڵام دڵت بەحاڵی دایکت دا ناسوێ؟ دایکت کەوا دایکێکی خراپ نیە جێی بهێڵی و ڕاکەی!

یەشار وتی: ـ بیرم لەوە کردۆتەوە: ـ ڕۆژێك پێش ڕۆیشتن پێی دەڵێم.

دایە گەورە وتی، ئەگەر قبول بکا، ئەوا باشە، تۆش دەبەین.

ئولدوزو یەشار بە کەیف هاتن و بەخێرایی پرژانە سەر ئیش کردن.

*** ماسی دزان، خوری دزان**

*** دوعای بێ ئەسەر.**

یەشار لە تاقی کردنەوەدا سەرکەوت: ڕۆژێك کە کارتەکەی هێنایەوە ماڵ، نامەیە کیشی بۆ باوکی نوسی. ئولدوز یەشار زۆربەی کات بەیەکەوە بوون. باوەژن کە متر ئازاری دەدان. لەڕاستیدا، دەیوویست ئولدوز لەبەرچاویدا دورکەوێتەوە. جگە لەوەش، هەمیشە بۆ قەلەرەشەکان هەزنیگەران بوو. قەلەرەشەکان، زۆر هات و چۆیان دەکردو نیگەرانیان دەکرد، دەترسا لە ئەنجامدا بەڵایەکی بەسەردا بێت.

باوکیشی نارەحەت بوو. بەتایبەتی کە ڕۆژێك چووە سەر حەوزەوەو دیتی ماسیەکانی تێدانەماوە. قەلەخان و براکەی دوو ماسی یان خوارد بوو، یەکێکیشیان داپیرە دایکیان خوارد بووی، ئەواتی تریش قەلەرەشەکانی دیکە خواردبوویان. باوەژن و باوکی لە هەر جێیەکدا قەلەرەشیان دەبینی جوێنیان پێ دەدان، بەردیان تێدەگرتن ڕۆژێك باوکی ئولدوز کشمیشی هێنا بۆوە تا باوەژن لە ناوسرکەی کا. باوەژن مەنجەڵی دەست دایەو بردیە سەربان. بەردەکانی وەرگێڕو بەرگێرکرد. لەپڕێك خوریەکی زۆر بەدیار کەوت. خوریەکانی هەڵگرت و بۆلای مێردەکەی هێناو وتی: ـ دەبینی؟ «لە مەچێتر» هاتونەتەوە ماڵەکەمان. ئێستا دەستیان لێ هەڵنەگرتووین. کێ ئەمانەی لەناو بەردەکاندا داناوە؟

باوکە وتی: ـ دەبێ پێشیان بگرین.

باوەژن وتی: ـ بەیانی بۆلای دوعانوس دەچم. دوعایەکی باشی لێ وەردەگرم «لە مەچێتران» بترسێنێ و ڕابکەن.

ئولدوز بۆبەیانی یەشاری بینی. قسەکانی بۆگێڕایەوە. یەشار پێکەنی و وتی: ـ دەبێ خوریەکان بدزین. دەنا ئێشمان چەند ڕۆژێك دوادەگەوێ. ئولدوز خوریەکانی دزی. هێنایان لەناو کولیتی چۆڵی سەگیان دانا. یەشار سەیریکرد کە خوری بەپێی پێوویستیان کۆبۆنەوە. ئاگاداری قەلەرەشەکانیان کرد کە چیتر خوری نەهێنن. باوەژن چوەلای دوعانوس و دوعایەکی باشی وەرگرت. بەڵام وەختێ کە بینی خوریەکانیان بردوە. دڵی لە جاران زیاتر کەوتە لێدان و تەپە تەپ.

*** یەشار ڕوخسەت لەدایکی وەردەگرێ.**

*** مەسەلەی سەگە زمانی تێك گەیشتن.**

منداڵەکان لەوڕۆژە بەدواوە، دەستیان بە تۆرچین کرد. یەکەمجار پەتکی ئەستوریان دروست کرد. پاشدان دەستیان بە گرێ لێدان کرد. دایکی یەشار ڕەختەبەندێکی درێژی هەبوو، ئەم ڕەختەبەندە چەند ڕشتە سمێك بوو لێمکیان پێچابوو، یەشار دەیوویست ڕەختە بەندەکە لە دایکی بباو لەگەڵ پەتکەکان لێکی گرێدا تاکو تۆرەکە تۆکمەتر ببێ.

شەوێك لەسەر شیو خواردندا بەدایکی وت: ـ دایە، گەر من چەند ڕۆژێك سەفەریکەم، زۆر خەم دەخۆی؟

دایکی وای زانی یەشار گاڵتە دەکا.

یەشار دوبارە پرسی یەوە: ـ دایە، ڕوخسەتم دەدەیەی چەند ڕۆژێك

بەسەفەر بڕۆم؟ پەیمانت پێ‌دەدەم کە زوو بگەڕێمەوە.

دایکی وتی: ـ یەکەم جاردەبێ خۆت بزانی پارەی سەفەر لە کوێ بێنین؟

یەشار وتی: ـ پێویست بەپارە ناکا.

دایکی وتی: ـ باشە لەگەڵ کێدا دەڕۆی؟

یەشار وتی: ـ ئێستا ناتوانم پێت بڵێم، کاتی ڕۆیشتن دەزانی.

دایکی وتی: ـ باشە، بۆ کوێ دەچی؟

یەشار وتی: ـ ئەمەشیانت لە کاتی ڕۆیشتن پێدەڵێم.

دایکی وتی: ـ باشە منیش کاتی ڕۆیشتن روخسەنت دەدەم.

دایکی وای دەزانی کە یەشار بەراستی گاڵتە دەکاو دەیویست هەندێك قسەی گەورە گەورەی وەك دەوری منداڵی بکا. ئەوکاتەی کە یەشار قوتابی پۆلی یەکەم بوو. ناوناوە ئەم قسە قەڵەوانەی دەکرد. بۆ نمونە لەسەر سەرین دادەنیشت و دەیوت: ـ دەمەوێ بفرمە ئاسمان، چەد دانەیەك لەو ئەستێرە وردیلانە بگرم و بیهێنم بیکەمە دوگمەی کورتەکەکەم.

ئیتر نەیدەزانی کەهەر یەکێك لەو «ئەستێرە وردیلانە» سەدان ملیۆن جاریش لەوە گەورەترە کە ئەو دەیبینێ و لەویش گەورەتر و هەندێکیشیان هەزارەها جار لە ئاگری ناو ئاگردانەکەیان گەرم ترە.

ڕۆژێکیش سە گێکی ڕەشی بەرەلای بەخشکەخشك بۆماڵەوە هێنابوو. وەختی نیوە ڕۆبوو یەشار لە قوتابخانە دەگەڕایەوە دایەوباوەی وتیان: ـ ڕۆڵە بۆچی ئەم سەگەپیسەت هێناوەتە ماڵەوە؟

یەشار لوتی بەرزکردەوەو بە لەخۆبایی بونێکەوە وتی: ـ ئەم قسەیە مەکەن.. ئەم سەگە لەقسە دەگا. ماوەیەکی زۆر ئازارم چێشتووەو فێرە زمانم کردوە. ئێستا هەرچی‌یەکی پێ‌بڵێین بەقسەمان دەکا.

باوکی بەپێکەنینەوە وتی: ـ ئەگەر ڕاست دەکەی، پێی‌بڵێ بچێ دوو نان بکڕێ‌و بیهێنێتەوە، ئەمەیش پارەکەی.

یەشار وتی: ـ لەپێشدا دەبێ نان بخواو پاشدان.

دایکی یەشار نەختێك نانە ڕەقی لەبەردەمی سەگەکەدا رووکرد. سەگەخواردی‌و کلکەلەقێ‌ی کرد. یەشار بەسەگەکەی.

وت: ـ هاوڕێم، تێگەیشم چ دەڵێی.

باوکی وتی: ـ باشە، یەشار چی دەڵێ؟

یەشار وتی: ـ دەڵێ: «یەشار گیان» شتێك لە ناو ددانەکانمدا چەقیوە، تکات لێدەکەم دەمم بکەرەوەو بۆم دەر بێنە!».

دایەو باوەی بەسەرسورمانەوە سەیریان دەکرد. یەشار لەسەرەخۆ دەمی سەگەکەی کردەوەو دەستی برد، ناودەمی‌و تا کەلێنی ددانەکانی سەگەکە پاك کاتەوە. لەپڕێك سەگە دەست و پێ‌ی ڕاوەساندو نەیهێشت و ناڵەناڵی یەشار بەرزبۆو. باوکی یەشار بەخێرایی سەگەکەی دەرکردە دەرەوە. دژستی یەشار لە چەند جێدا برینداربوو بێ‌پسانەوە ئاخ و ئۆفی دەکرد.

ئەو ڕۆژە یەشار بە دایکی وت: ـ وەختی ڕۆیشتن هەر دەدە بیتێ؟

دایکی وتی: ـ بەڵێ.

یەشار باشەدایە.. ڕەختە بەندە کە شتسم دەدەیەی؟

دایکی وتی: ـ چێشت پێ‌یەتی؟ دیسان چیت لە بن سەردایە ڕۆڵە گیان؟

یەشار وتی: ـ هیچ کەلەك و مەلەکم لە ژێر سەردا نی‌یە، بۆ سەفەرەکەم پێووبستمە.

دایکی سەرسام مابوو. نەیدەزانی مەبەستی کورەکەی چیە.

لەدوایی‌دا ڕازی‌بوو کە ڕەختە بەندەکە بۆ یەشار بێ ئەووەختەی دەیانوویست، بخەون، یەشار وتی: ـ دایە؟

دایکی وتی: ـ هابڵێ!

**یەشار وتی: ـ بەڵێم پێ‌دەدەی ئەم قسەیە بەکەس نەڵێ؟**

دایکی وتی: ـ دڵنیابە، بەکەس ناڵێم. بەڵام تۆدەزانی گەر باوکت لێرە بایە بەم قسانەت پێدەکەنی؟

یەشار هیچی نەوت: ـ لە حەوشەدا نووستبون و سەیری ئەستێرە دڵرفێنەکانی دەکرد.

*** ڕۆژی سەفەرکردن**

کاتی خێرایی دەڕۆیشت. دایکی یەشار زۆربەی ڕۆژان نیوەڕۆش بۆ ماڵ نەدەهاتەوە. هەڵی ئیش کردن بۆیەشار زۆر بوو. قەلەڕەشەکان هاتو چۆیان کەم کرد بۆوە. باوەژ ن زۆر چاوەدێر بوو داپیرە دەیووت: ـ وا باشتر کەمتر ببێبن و بچین. دەنا، باوەژ ن بۆن دەکاو ئیشەکانمان تێك دەچێ.

لەکۆتایی مانگی نیربوو کە تۆر ئامادەبوو. داپیرەهات، تۆرەکەی بینی‌و پەسنەدی کردو وتی: ـ ئەوهەمووزەحمەتەتان کێشا، ئێستاش کاتی ئەوەهاتووە بەکاری بهێنن و سودی لێ‌وەرگرن.

یەشارو ئولدوز وتیان: ـ کەی دەڕۆین؟

داپیرە وتی: ـ ئەگەر حەزدەکەن، هەر سبەینێ نیوەڕۆ دەڕۆین.

ئولدوزو یەشار وتیان: ـ هەرچەند زوتر بێ باشترە.

داپیرە وتی: ـ کەواتە، بەیانی نیوە ڕۆچاوەڕێ بن، هەروەختێك گوێتان لی‌بوو دوو قەلەڕەش سێ جاران قرەقریان کرد. دەست دەنە تۆرەکەو وەرنە سەربان.

. منداڵەکان لەخۆشیان شاگەشکە ببوون. حەزیان دەکرد هەڵسن و هەڵپەڕن و سەما بکەن. کە مێکیش قسەیان لێرەو لەوێدا کرد داپیرە فڕی‌و ڕۆیشت چەندماڵ لەولاتر لەسەر دار تەوورێزیەك دا هەڵنیشت، قرەقری کرد، یەك دوو تەکانی‌داو، بەرز بۆوەو دوورکەوتەوە.

*** ئەوانەی کە ئاگایان لە ناودڵی کەسدانیە**

**دەڵێن: ـ ئولدوز شێت بووە!**

شەوداهات. لەسەر شیوخواردن دا ئولدوز لەبەر خۆیەوە پێدەکەنی باوەژ ن دەیووت: ـ ئەم کچە تیوەشێت بووە. باوکی لێ‌ی پرستی: ـ کچم، ئاخر تۆبەچی پێدەکەنی؟ من شتێك نابینم شیاوی پێکەنین بێ.

ئولدوز دەیوت: ـ لە خۆشیان پێ‌دەکەنم. باوەژ ن پەست وتورەدەبوو.

باوکی دە پیرسی: ـ لەخۆشی چیدا؟

ئولدوز دەیووت: ـ ئای، هەروا دڵشادم، هیچ لە گۆڕێ نیە.

باوەژن دیووت: ـ وەلی کە، بەسەری پەڕیوە.

•

*** دایکی باش و میهرەبان.**

وەختی خەفتنان بوو. یەشار بەدایکی وت: ـ دایە، دەتوانی سبەینێ نیوە رۆ لە ماڵ بی؟

دایکی وتی: ـ ئیشت پێم هەیە؟

یەشار وتی: ـ بەڵێ، سبەینێ نیوە رۆ پێت دەڵێم، لەبارەی سەفەرەکەمەوەیە.

دایکی وتی: ـ زۆر باشە، نیوەرۆ دێمەوە.

دایکـە سەری لە کاری یەشار دەرنـەدەچـوو. لەراستیـدا، مەوزوعی سەفـەرەکـەیشی لەبیـرکـردبـووپاشدان بەبیری هاتەوە. بەڵام دەیزانی کە یەشـار کوڕێکی باشـەو کارێکی خراپ ناکا. ئەوی زۆر خۆش دەویست. ئەو رۆژانـەی کە دەچـووە خۆشـوشتن، بیری لەلای یەشاربوو. جاری وا دەبـوو کە خۆی بەبـرسی یـەتی دەمـایـەوە، بەڵام جل وبـەرگ و قەڵـەم و کاغـەزی بۆئەودەکـری. دایکێکی باش ومیهـرەبـان بوو. یەشـاریش بۆ هەموو کارێکی بچوك فێلی لێ نەدەکرد، ئازاری نەدەدا.

*** رۆیشتن.**

*** ئولدوز لە زینداندا.**

رۆژ بۆوە، چەنـد سەعـاتێکی تـر وەختی رۆیشتن دادەهـات. زەمـان لەسـەرە خۆدەرۆیشت. یەشـارلـە ماڵـەوە بەتـەنیا بوو، قەراروئارامی لێ هەڵگیـرابـوو. لە حەوشـەدا بەم بەرو ئەوبـەر هات وچـۆی دەکـرد وبیری لەلای دایکی وئولـدوزدا بوو. چەنـد جاران تۆرەکـەی دەرهێنـاولەنـاو حەوشەدا رایخست، لەسەری دانیشت، پاشدان کۆی کردەوەو لە شوێنی خۆی دانایەوە.

نیـوەرۆدایکـی هاتـەوە. نان ویەنیـروترێی کرێ بوو، دانیشتن فراوینیان خوارد. یەشار بۆ ئولدوز نیگەران بوو. دایکی چاوەروان بوو کە کورەکـەی قسـە بکـا. هیچیـان قسەیان نەدەکرد. یەشار بیری دەکردەوە: ئەگەر ئولدوز نەتوانی بێ، چی دەبێ؟ نەخشەکەمان هەڵدەوەشێتەوە. گەر باوەژنم بکـەوتـە دەست، دەزانم چی لێدەکەم. چنگە لەقژی گیردەکەم. ئێسـتـك قویس! بۆچـی نایـەلی ئولـدوز بێتـەلام گەر ئێستـا دەنگی قەلەرەشەکان بێت، چی بکەم؟ ئێستا ئولدوز نەهاتووە. خەریکە دڵم بتەقێ..

بەفێڵی ئاوهێنـان بۆحەوشـە چوو. دەنگی باوکی ئولـدوز باوەژنی لەولای دیـوارەوە دەهـات. باوکی ئولـدوز دەستی دەشـوشت وژنەکەیشی ئاوی بەدەستی دادەکـرد دیـاربـووتازە باوکی ئولدوز تازە بۆماڵ گەرابۆوە.

باوەژن دەیـوت: ـ نازانی ئەم کچـە تیـوە چ بەڵایـەکی بەسەردا هێناوم، لەئـەنجـامـدا ناچـار بووم لە موتبەقدا حەپسی کەم.. لەهەمان کاتدا دوو قەلەرەشکە لەسەر دارتەورێزیدا هەڵنیشتن، یەشار کە ئەوانی بینی، دڵی داخـورپـا. ئەدی ئیتـر چی لە ئولـدوز بکـا؟ دایکی بەدوایدا بنێرێ؟ ناکا باوەژنی بەراستی بەندی کردبێ!

قەلـەرەشکـەکان فرین و هاتنە نزیك وگەیشتنە سەری سەری یەشار. زەردە خەنەیەکیان بۆکردو لەسەردار تودا نیشتن و لەپر پێکەوە دەستیان بە قرەقرکرد.

ـ قر... قرا.. قر... قرا قر... قرا..

دەنگی قەلـەرەشـەکـان لە لانێکەوە وەك شەیپوری جەنگ بوو: ـ هەم ترسی ناوەوهەم جمـووجـوڵ. یەشـار لە حزیـەك دەست وپێی خۆی ون کرد. بەخـۆی داهـات وزۆر بە خوێن ساردی بۆلای کولانەوە چوو، تۆرەکـەی هەڵگـرت وبە سەبـری چووە سەربـان باوەژن وباوکی ئولـدوز چووبـونـە ژوورەوە. قەلـەرەشـەکـان هاتن لەتەنیشت یەشاردا دانیشتن و لەهـەواڵیـان پرسی. یەشار تۆرەکەی بڵاوکردەوە. ئێستا ئولدوز نەهاتبوو. نیـو دەقـەرابـورد. یەشـار سەیـری دەوروبەریکرد. لەلای چەپ، لەدور دوروەوە پۆل پۆلە رەشایی یەك بەدیارکەوت و دەجولاو دەهاتە پێش، یەکێك لە قەلەرەشەکان وتی: ـ واخەریکە دێن، ئولدوز بۆچی نایە؟

یەشار وتی: ـ نازانم، رەنگە باوەژنی حەپسی کردبێ.

رەشاتیە کە نزیکتر بۆوە. بەکزی دەنگی قرەقر لێك دەهاتە گوێ.

ئولـدوز هەر نەهـات. قەلـەرەشـەکـان گەیشتن. قرەقـری. هەزاران قەلـەرەش سەر زەمین وئاسمـانی پرکـرد. هەمـوو دەرودیوار لەقەلەرەشدا رەش داگـەرا. لە سەر دار تودا شوێنێکی چۆل نەمـا. خەڵـك لە ماڵـە هاتبـوونـە دەرەوە. ترس باڵی بەسـەر هەمووواندا کێشابوو. دایکی ئولدوز مەنجـەڵێکی لەسـەر سەری دانـابـوولە ناوەراستی حەوشەدا راوەستابوو، دیقێژاند: ـ یەشار بۆ کوێ چووی؟ ئێستا چاوەکانت دەردەهێنن!

یەشـار کە گوێی لەدەنگی دایکی بـوو، چووە سەر سوانـدەووتی: ـ دایـە، دایـە مەتـرسـە! ئەوانـە هاورێی من، گەر منت خۆشدەوێ، برۆ ئولـدوز بنێـرەسەربان. دایە، تکات لێدەکەم! دایە! ئێمە دەبی پێکەوەمان سەفەر بکەین..

دایکی مات و سەرسـام سەیـری یەشـاری دەکـردو هیچی نەدەوت.

یەشـار دیسـان پارایـەوە: ـ دایـە بروا تکـات لێدەکەم.. ئەم قەلەرەشانە هاورێی ئێمەن. لێیان مەترسە!

یەشـار نەیـدەزانی چی بکـا. هێنـدەی نەمـابوودەست بەگریان بکا.

داپیـرە هاتـە پێشـەوەووتی: ـ تۆبرۆلەسـەر تۆرەکـە دانیشە، من بەخۆم و چەند قەلەشێکەوە بەدوای ئولدوز دادەچم، بزانم کە کوێ داماوەتەوە.

قرەقـری قەلـەرەشـەکان زۆر خەڵکی هێنابووە حەوشەکانەوە. هەر سەر ستێکی لە سەر سەریدا نابـوو، بەترسـەوە سەیـری ئاسمـانی دەکـرد، هەنـدێ کەس لەتـرسـان لەودیـوی پەنجەرەکاندا مابوونەوە. پیرە ژنەکان دەیـان زیـرانـد: ـ بەڵا باریـوە! برۆن دوعـابکـەن، نوێـژ بکـەن، خێرو قوربانی لە خۆتان بگرن!

لە پرێـك باوکی ئولـدوز دارێکی بەدەستـەوە بوو هاتـە حەوشـەوە. باوەژنیش لەدوای دا هاتـە دەرەوە. هەریەکەیان مەنجەڵێکی بەسەرسەری

خۆیـدا کردبـوو. داپیـره وتی : ـ قەلـەرەشینە، لەدەست وپێی ئەم ژن و پیاوەوە ئاڵێن، نەهێڵن بجوڵێن.

به دەنگێکی بەرزەوە وتی : ـ هۆ قەلەرەشینە، بجوڵێن؟

لەنـاکـاودا قەلـەرەشەکان بەخۆشی هاتن و جولاّن. پەچرنوك و دەنوك تۆڕەکەیان گرت و بەرزیان کردەوە. یەشار شتەکانی بەرۆخەکانی تۆڕەکەدا بەستبۆوە. قەلـەرەشـەکـان ئەوانیشیـان گرتبوو، یەشار لەسەرەوە هاواری کرد: دایە، ئێمە وارۆیشتین، سەلام لەباوکم، زوو دەگەڕێینەوە، خەم مەخۆ؟

قەلـەرەشـەکان باوك و باوەژنی ئولدوزیان لەحاڵی خۆیاندا بەجێهێشت ورۆیـشـتـن، هەردوکـیـان لەنـاوەراسـتی حەوشـەدا ڕاوەسـتـابـوون، هات وهاواریان بووو داروبەردیان تێدەگرتن.

جلەکـانیـان هەلاهـەلا بـوور چەنـد جێگـایەکیکیشیان برینداربووو لەئەنجامدا لەشار دورکەوتنەوە.

هەزاران قەلەرەش دەورو بەری منداڵەکانیان گرتبوو. تەنیا سەرسەریان چۆل بوو. ئولـدوز سەیـرێکی هەورەکـانی کردو لەبـەر خۆیـەوە ووتی : ـ چەند جوانن!

قەلەرەشەکانی قرەقریان دەکردو دەڕۆیشتن.

بەرەو شاری قەلەرەشکان دەچوون.

بەرەوشـوێنێـك دەچـوون کەلەماڵی باوکی ئولدوز باشتربوو. دەچوونە شوێنێك کە باوەژنی لێ نەبوو.

*** مەقلولەکان بودور فرێدەن!**

*** بەیادی برادەرانی شەهیدوناکام.**

داپیـرەو، قەلـەخـان و کاکەقەلەرەش هاتن لەلای منداڵەکان نیشتن تا چەنـد قسەیەك بکەن و پاشدان بڕۆن وەك ئەوانی دی ئیش بکەن. ئولدوز بوخچـەکـەی کردەوە. کراسێکی دەرهێناو بەیەشاری وت : ـ هی باوکمە. لەدوایی دا لەرە دەکەی : ـ

یەشار سوپاسی کرد.

لەنـاو بوخچەدا هەندێك نان و کەرەهەبوو. ئولدوز چەند پەرەموچێکی قەلـەرەش لەبـاخـەڵی دا دەرهێنا، دایە داپیرەو پێی وت : ـ داپیرە، ئەمانە پەڕی بێچـووە قەلـەرەشـەکەنە بۆیادگاری هەڵمان گرتبوو تا بیدەینە ئێوە. من و یەشـار قەلـەرەشکوکەکەو دایکی قەت لەبیرناکەین. ئەوان لەپێناوی ئێمەدا کوژ ران.

دایەگەورە پەرەموچەکانی وەرگرت، فرییەئاسمان لەسەرسەری منداڵ و قەلەرەشەکانەوە بەدەنگێکی بەرز هاواری کرد: ـ بەیارمەتیتان دەمەوێ دوو قسە بکەم.

قەلـەرەشـەکـان بێـدەنـگ بوو. دایەگەورە مەمکۆلەکەی لەژێر باڵیەوە دەرهێنـا ووتی : ـ دۆستـانی ئەزیـزم! قەلـەرەشـە نازدارەکانم! هەر ئێستا ئولـدوز چەنـد پەڕێکی بێچـووە قەلـەرەشـەکـەی دایـە من. ئێمـە هەڵیـان دەگـرین. لەبـەرئـەوەی تاکـە نیشانەی دایك و رۆلەی میهرەبان و بەوەفاو گیان فیدایە. ئەم پەڕانە فێرمان دەکەن کەئێمەش چاك و ئازابین.

ئولدوز یەشار هاواریان کرد.

قەلەرەشەکان بەدەنگی بەرز قیراندیان.

دایـەگـەورە درێـژەی بەقسەکانی داو بەلاّم ئەم (مەمکۆلە) بۆدور فڕێ دەدەبن. چونکە باوەژ ن بۆی کری‌بوو تاکو هەمووکات هەر بیمژێ و ماوەی نەبێ قسەبکاو دەردی دڵی بەکەس بڵێ.

ئولـدوز مەقلۆکـەی خۆی ناسی‌یەوە. ئەو مەقلۆلە بووکە لەکاتی خۆیدا دابوویە پورقەلەرەش.

داپیـره مەقلۆلەکەی فریدایە خوارەوە. قەلەرەشەکان هەلهەلەیان لێدا. دایـەگـەورە وتـی : ـ باوەژ ن پور قەلـەرەشـی کوشـت، بێـچـووە قەلـەرەشـەکـەیشی جوانـە مەرگ کرد، بەلاّم یەشـارو ئولـدوز ئەوانیـان لەبیـرنـەکـرد. ئیتـر، هەربژی ئەومندالاّنەی کەوا هەرگیز دۆستە شەهیدو ناکامەکانی خۆیان لەبیر ناکەن!

قەلـەرەشـەکـان بەدەنگێکی بەرزەوە قرەقـریـان کرد. ئولـدوز یەشـار چەپلەیان لێ داو هاواریان کرد.

*** لەسەر ئەو چیایانە**

*** شاری قەلەرەشان**

*** قەلەرەشە چیا نیشنەکان**

چیای بەرز بەرز لەدر، ،وە بەدیارکەوتن. دایەگەورە هاتە خوارەوە وتی : ـ سەرئـەوچیـایـانـە، شاری قەلـەرەشانە. سەیرتان پێ نەیە کە بۆچی ئێمە هاتووین لە ئەم چیایانەدا نیشتەجێ بوینە. قەلەرەش گەلێ جۆرن.

نامەی دۆستان.

ئەمـەس نامـەی پر لەخـۆشـەویستی ئەو منداڵانەیە چیرۆکی «ئولدوزو قەلـەرەشـەکـانـیـان» بەر لەچـاپ بونی بیستـووەو نەیـان ویـست لێ ی بێـدەنـگ بن. نامـەکـە بەهۆی مامۆستای ئەو منداڵانە بەدەستی ئەم نووسەرە گەیشتووە :

سلاّو لەبـرادەرانی ئی‌ولدوز هەرکەسێ خەبەرێکی ئولدوزمان بۆبهێنێ خەلاّنی دەکـەین. ئێمـە بۆ قەلـەرەشـەکـان نیگەرانین، بۆیەشارو ئولدوز نیگـەرانین. ئێمـە زۆرمـان سابون هەیە. دەمانەوێ بیدەینە ئولدوز. ئێمە چاوەروانی بەهـارین. ئیتـر قەلـەرەشـەکـان ئازارنادەین دەمانەوێ هەموو دایکێـك وەك پور قەلـەرەش بێ. پور قەلەرەش دایك بوو. ئێمە دایکمان خۆشـدەوێ. پور قەلـەرەش مێـردەکەی خۆشدەوویـست. حەزدەکەین کە دایکی ئێمـەش، باوکمـانی خۆشبـووێ. ئێمـە وامان بەخەیاڵ دا دێ کە بێچـووە قەلـە، ئولـدوز یەشـار بۆشەرچوونە. لەگەڵ باوکان، باوەژنان دا شەربکـەن. ئێمـە تیـرو کەوان بۆیەشـار دروست دەکـەین. هێـلانـەی قەلـەرەشـان تێـك نادەین تا بێچـووە قەلـەرەش لەوبـەرزایی‌یـە بنیشێ و هەرکاتێ باوك و باوەژنی هاتنەوە، ئاکاداری ئولدوزبکا. ئێمە جل وبەرگو پێـلاو دەدەینـە ئولـدوز. ماسـیـایـەکان دەدزین. جالجالۆکە کۆدەکەینەوە. موژدەو خەلاّت بۆ بێچووە قەلەرەش دەینین. لەجەنگ داسـەردەکەون. بو بیچووه قەلەرەش دەینین. لەجەنگ دا سەردەکەون. یەشار دەستی ئولـدوز دەگـرێ و دێن. ئولـدوز دەبێـە دایکێکی باش و یەشـاریش بە باوکێکی میهـرەبـان. ئێمـە لەزەمـاوەنـدی ئەوانـدا شایی دەکـەین. ئێمە نیگەرانیین. بۆهەموویان نیگەرانیین. دەمانەوێ بۆیارمەتی‌دانیان بچین. دەمانەوێ ئەوان زوو لە شاری قەلەرەشاندا بگەڕێنەوە.

# شاهین



«ئەحمەد عارف» شاعیرێکی گەورەی هاوچەرخی کوردی دیاربەکرە. بەشار کەمالی زۆری لەمەڕ دوواوە. تەنانەت دەڵێ لە ناظم حیکمەت، شاعیری گەورەو جیهانیی تورك گەلێ دەوڵەمەندترە، چونکە شارەزای ئەدەبیاتی کۆن و نوێی ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوایە، بنەمای شارەزایی‌یەکەی لە ناخی ئەزموونێکی ئێکجار قووڵ و ڕەسەنەوە هەڵدەقوڵێ.

شیعری بە کوردی‌و بە تورکی زۆرن، لە عەرەبی‌و فارسی‌و تورکی‌و کوردی بەئەدەبیاتەوە زۆر شارەزایە.

ئەمەی لێردا بڵاوی ئەکەینەوە، پارچە شیعرێکیەتی بە کرمانجیی سەروو، لەگەڵ وەرگێڕانیا بۆ کرمانجیی خواروو.

• شوکور مستەفا •

کردوویە بە کرمانجیی با شوور

**«شــاهين» و «دوڵی لاچ» دوو بەیتی کوردین، بە شێـوەی «زازا» کە لە شەرەکـانی دێـرسمیـدا گوتـراون . والێـرەدا هەردووکیان بە «زازایی»و کرمانجیی خوارو و بڵاودەکەینەوە .**

---

خۆزاتی پەرسەنا جادێ تۆزنۆفیلی . . .
هەق ئادربێ ئاڤدلاّ پاشای ڤەردۆ
کۆتۆ قەراجە مۆردەمێ پیلی!
شاهین ڤانۆ قەدەرێ جانێ خۆو بزانێ
ما سەرێ جێرەنێ قانوونێ . . .
ئاخ دە بییە، بییە نا بەما بییە!
شاهینێ م گۆلێ دە خۆو گورە تۆ
شیا باسقنێ ئالایییە : . . . . .
ڤانۆ، «تەرسام سارێ م تاڵدە کوویۆ
کۆینێ دێرسیم دە نێ مانۆ چەنا ئوجەنییە. . . . .» .
ئاخ، کۆرۆمەردێیا ب هەنییۆ!
ئەسکەر ناوۆ ئامۆ کۆیێ دێرسیمی موونییۆ
شاهین ڤانۆ «د سارەی ڤیادرنای م را،
ژوویێ خانم ئۆ، ژوویێ عالیشێر ئەفەندییۆ. . . . .» .
شاهینێ م گۆلێ دە خۆو گورەتۆ
شیۆ گەچێ کۆیێ موززری
ڤانۆ، «لاوۆ بێبەختێ مەکەرێ
ما پیبا وێردۆ قوربانێ خزری!» .
«ئاشیر مەردانا م رێ قاییل نە بەنێ
تۆرنێ بابای کەردێ ئیمامێ سەری
خۆزاتی پەرسەنا گەرەخلانرا ناتۆ
قانوونێ مستەفا کەمالی پەرسەنا
ج چییۆدە. . وۆ» .
شاهین ڤانۆ لازێ پرچۆیرە «مساورە مەسۆ
من و تۆجزیکێ زومایێ لیتۆ» .
هەقۆت کێش سەردە مایە م یا!
برای سارێ برای بەردا چادرە دە رۆتۆ
شاهینێ م رێ ئەفکار نێ بۆ
حەسەن حیفێ تۆگورە تۆ
ئاخ دە بییە، شاهینێ م بییە!
شاهینێ م کە مەردۆ نێ مەردۆ
شکییا تلسەمێ کرمانجییە!
پانە پانە، شاهینێ م پانە!
ئەسکەرێ مستێ ( . . . ) ئامۆ ما قرکەنۆ
جگەرا م پاتە وویی!
مەزال ج مە ئەسکەرێ ستێ ( . . . ) ئامۆ ما فرگەنۆ دە پانە!

## دەرێ لاچی

وەلا وەلا، وەلا یەمانۆ
ئۆردو ئورزا را ئامۆ، دۆرمێ ما قاپانۆ
چێ عەشیرۆ برژ ییۆ
کەس دەسترامانێ دانۆ
شێرێ دەرێ لاچی
تە دە مزو دومانۆ
بەختێ حەیدەرو بە دەمەن رێ
کەس خراڤە نێ ڤانۆ. . .
ئۆردویێ حوکماتی زافۆ
جایێ وەلاخە ما نێدانۆ
ما زوڤوونی قرکەمە
چەمێ موزری جەندەق و لاسۆ ئانۆ .
ئۆندێر دە دا پێرۆ
تە دە شین و شوانۆ
دەرێ لاچی بڤێسۆ!
ئیڤێسێ م گاڤانۆ.
بر پێرۆدێ! نا قەوخا عەشیرێ نیە
مرەڤێ کرمانجان و زالمانێ. . یانۆ! . . .
دەستێ خۆو را خۆو مە جێرێ
سار ما رێ کۆلایە ڤانۆ. .
پەپووگ بێرۆ بنیسۆ، جەنجوونێ مارە بوانۆ
قەمەرێ حەسێنی ڤەری مخارە دە گنۆوارۆ
مالۆ شێرێ منۆ، بێرانۆ!
نەسێ کالی کونۆ قەوخا

به سووڤه گۆشت گرانۆ
هەمێ جووێ کێژی پەرسەنێ
خسمی ئۆردوویۆ، تابوورانۆ!
ئیڤیس خۆو سانۆ پول خاتوونه
هەم دانۆ پیرۆ هەم قەیدوو ڤانۆ
گۆشتۆ ڤەنگی رئیڤیسی یەنۆ
شێرێ م هالاسا ڤانۆ. .
ڤانۆ «تۆ هیرە ئۆردی ئۆنتێ ما سەردە
ئاخری دین ئیسلامۆ!
دەستێ هەقی دامە پیرۆ
ئۆردوویێ تۆرا نەفەر نێ ڤەردامە. ».
دەرێ لاچی بڤێسۆ!
ئیڤیسێ م چەتۆ
دەرێ لاچی بڤێسۆ!
باڤۆ قرڤانۆ چەتۆ. .
ئۆردی ئورزارا ئامۆ
دۆرمەرا ما قورەتۆ
دەستێ خۆو را خۆو مە جێرێ
ما حێڤێ ئازێ ئازێ خۆو قورەتۆ. . .
قرکەمە نە قرکەمە، نە قەدینۆ
ئۆردیی دەڤلەتۆ!
کام کە ما را بمرۆ
جرێ سەلتەنەتۆ!
لاچی سەرێ دا مە پیرۆ
ئاسمێ را رۆز ڤینە تۆ
ئۆردی ڤرەنییا تۆ دەرۆ
ئیڤێسی م خۆو ڤییارنا کەمەرە
باڤۆ گۆری خۆو ڤییارنا کەمەرە!
سەکە پۆلاتە گنێرۆ ئیڤێسی م
ئەسکەر کۆت بە دەرە
هەڤۆ چ یەمانۆ مالێ تارڤا جیگەرە!
«باڤۆ پیرۆدە، مەیت، 831 جا مەڤەردە
هەڤ کەنا تەیی بەرە!».

ئەورۆ زۆر کەردۆ قۆلێ هەتێ پێتەرە
ئیڤێسێ م کشییۆ ئەسکەر کۆتۆ دەرە
لاچی ڤەردە ئیڤیسێ م سۆنا شییا هێرە
لازێ م دەست و بۆزی سەمەرنێوە
کۆتۆرا وەرتێ تابوورە. .
بکۆ لەرزە مەکە
راوەر مە سۆ، رەو مە مرە!
ئۆرریبیا زالمی زافۆ
دینا ما سەرۆکەردا سۆزا سوورە. .
چێ عەشیرۆنێ خایین و برژییۆ!
قرکەردانا مادە رشوەت و پەرە
شما کە تەسەلییە خۆو ما را گورەتە
مەستە ـ برۆ حالێ شما ژێ حالی ئەرمەنییانۆ. .
ما دۆپیرۆ
حێڤێ خۆو هۆت بەدەلی گورە تۆ. .
مەردانا گۆی پەرسەنێ
ما رێ سەلتەنەتۆ!

## شەهێن

لە خۆزاتێ دەپرسی؟ جادەی ئۆتومبیلە. .
وەجاغی کوێربێتەوە عەبدوڵڵا پاشا
رەگی کەڵەمێردان دەردێنێ!
شەهێن دەڵێ، بەهای گیانی خۆ بزانن
یاسای (. . .)ی بەسەر سەرتانەوە دەگەڕێ. .
ئاخ چمان لێ قەوما، چمان بەسەرهات!
شەهێن من پێشمەرگەیەکی بەگەڵ خۆداوە
چۆتە سەر بەتالیۆنێکی
«دەترسێم ئەمنیش بمرم،» دەڵێ
«کیژ و ژن لە چیای دێرسیمێ نەمێنێ». . [1]
خۆزی چیای بێ کانی نەبوایە بتوێتەوە رەببی
ئەسکەرهاتووە چیای دێرسیمی گەمارۆداوە
شەهێن دەڵێ «ئەوەتا دو سەری براویان بەبەردەم مدا

تێپەڕاندا، یەکیان هی خانمەو یەکیان هی عالیسێرە». [2]
شەهێنەکەم پێشمەرگەیەکی بەگەڵەخۆداوە
پەڕیوەتەوە ئەوبەری موزرێ
«هاورێ یینە، بێ بەختیمەکەن،» دەڵێ
«گوریی خدرلیاسێمان پێکەوە خوارد!» . .
«هۆزوتیران بە مردنم قاییل نابن
دژمن نەوەی بابای کردۆتە سەرەك نیشان . . . . [1]
لە هۆزاتێ دەپرسی لەم لای قەرەخلانەوەیە
لە یاسای مستەفا کەمال دەپرسی
ئامان چ یاساگەلێکی . . ».
شەهێن دەڵێ «کوری پرچۆ، لەگەڵ دژمندا وەراوێژمەکەوە
خۆ ئەمن و تۆ مەمکی یەك دایکمان مژیوە . . » .
خودایە ئەمە نیشانی کەس نەدەی!؟
ئەسکەر لەخێوەتدا
برا سەری برای دەفرۆشێ . .
شەهێن دەڵێ، دڵت ڕەحەت بێ
حەسەن تۆڵەی ساندیتەوە .
ئاخ تازە قەوما، ئەو قەوما لە شەهێنەکەم قەوما!
کوژایەوە ئەستێرەی بەختی کوردایەتی!
ئەسکەری مستێ ( . . . ) هاتوون دەمانکرژ ن
لێدە، هەردووچاوەکەم، لێدە!
ئەسکەری مستێ ( . . . ) هاتوون دەمانشکێنن
دەرفەتیان مەدە، لێدە!

## دۆڵی لاچ

حاڵمان پەرێشانە، پەرێشان
لەشکر هێوریوە، ئابلۆوقەی داوین .
وەجاغی عەشیرەتان کوێرەوە بێ!
خۆ کەسێ دەستێکی یارمەتی درێژناکا .
برۆن ببینن دۆڵی لاچێ
کەپ وتۆزە، هەرایە، چاوچاو نابینێ
کێ هەیە لە ئازایەتیو گەرناسیی
حەیدەران و دەمەنانییان بەگومان بێ . .
حوکومەت ئۆردووی زۆرن
ڕێگەی گوزەر بەکەس نادا
کورە تاکەی دوای یەکدی ببرینەوە
بروانە ڕۆخانەی موزوروولافاوی لاشە . .
دەڵێ، «کردتانین، بەسێ ئۆردووەوە
خۆ هەرچییەك بین ئێمەیش هەر موسوڵمانین!
شەردەکەین بە ئیزنی خودا
کماك لە قۆشەنو دەبرین . »
هەڵقرچێ دۆڵی لاچێ
ئیفیسم پێشمەرگەیە
هەڵقرچێ دۆڵی لاچێ
بابی بە قوربانی بێ، ئیفیسم پێشمەرگەیە . .
قۆشەن هەروا بە لێشاو دێ
دەوروبەری لێ تەنیوین
نەکەن دەستەوسان بوەستن
ساندمان تۆڵەی ئێزەوهۆزان!
بە شکاندن لەبن نایە
قۆشەن و ئۆردووی دەوڵەتی
خۆشبەخت ئەوکە سانەن کەوا
لەگەڵ مەدا دەمرن!
بۆ دۆڵی لاچێ دەجەنگین
خۆر لە ئاسمان سەیرمان دەکا
لەشکر ئەوبەری لێ گرتووین
ئیفیسەکەم وەرسووڕێوە
ڕۆڵە شیرینەکەم وەرسووڕێوە
لەبری وەی نوغرۆبێ، ئەویش شەردەکا
گوێگرە لە نرکەوخورژمی، لە گریەو شین وشەیۆری
نوغرۆبێ دۆڵی لاچێ!
ئیفیسەکەم بوارت ناداە . .
لێدەن براکانم، ئەمە شەڕی نێوعەشیرەتان نیە
شەڕی . . زالم و کوردانە! . . .
دەستەوسان مەوەستن

با ئیدیکە بە چاوی سووکمان نەنۆڕیتێ •

پەپووی ناوەخت بێ بنیشێتەوە بەسەر وێرانەماندا، بەسەر لاوانماندا خوێنێ.

ئەسمەرێ حەسێن لەبەر ئەسکەوتێدا پێکراوە

ئای لەبۆ ئەوی کەڵەئازایەم، مخابن لەبۆ ئەوی شێری دەلانێم!

حەسێنی کال دەچتە شەڕێ

ئازایانە، کەڵەمێردانە گووراوە

لە هەمێ جفێ کەژ ی دەپرسی

بارتەقای قۆشەنانە، بەراندر بە چەند تابوورانە

ئیڤییس پشتی بەسەری خاتوونەوەداوە

هەم شەڕدەکا، هەم لاوژان دەچڕێ

گوێ‌دێرن لە دەنگ و ئاوازی ئیڤیسێ

هەروا گوێ دێرن ئێوە، بزانن چدەڵێ..

کە گوللەی ماوزەر بەر ئیڤیسم دەکەوێ

ئەسکەر دەگەنە نێو دۆڵێ

خودا چەند گرانە ئازاری جگەرگۆشە!

وبابە بجەنگن، تەرمەکەم، بەجێ‌مەهێڵن

ئێوەو ئەشقی خودا دەگەڵ خۆتانم بەرن!

ئەمرو لەشکر زۆریان بۆ بەری شەڕی پەتەر هێنا

ئیڤیسم بە پێکراوی‌یە گەیشتە ناو دۆڵێ

ئیڤیسم سێبەری لە دۆڵی لاچێ هەڵداوە

کوری خۆم دەست و مەچەکی خۆی لێ‌هەڵماڵی‌وە

هەڵی کردۆتە نێو تابووری..

پەلە مەکە، کوری خۆم

زۆر مەچۆ پێشێ، زوو مەمرە!

لەشکری زاڵم زۆرو بێ‌شومارە

دنیایان لێ‌کردووین بە ساجی سوورەوەکراو بەسەرماندا..

وەجاغی عەشیرەتان کوێربێتەوە

بە شکانیان داین بۆ پارەو ریشوەت

بەڵام کە ئێمە لە بەربەرەکانی کەوتین

ئەوسا حاڵی ئێوەیش وەك حاڵی ئەرمەنی‌یەکانی لێ‌دێ.

کرمانجی

نۆتێن کەلا دیاربەکرێ و لۆریکا عادیلۆشێ

ئەحمەد عارف

دەستێ من ناچە.

کو بێوك و هونارێن وێرا جان دیاخ ناکە

ستوویێ خوە خواردکم، دچم

کارێ توورو مووران نینە بزانن

قە پرس مەکن

لا!!!!!!ل...

فەرمانا رەش دەربکەڤە سەر رێیان

بەخچێ یارێ تارو مار

پۆر خوین دکە.

تشتێ کو هەیە پاری‌یەك جانە

ژ بۆ قەداو بەلان ددم

ئەز بمرامە لۆوۆ.

دەست والامە

لنگ ب داڤ

لێ‌یمێ کو بزانە دیسا ئەزم

چ دژڤار دئەڤینم.

یەك ژ ی بێ‌زارو زمان

کەلا دیاربەکرێ...

- 2 -

ڤەدبە.

بوك خوینێ‌سۆر، سۆرگول

ئو ژ ئالیکیڤا بەرف دبارە

با د بە قەرەجەداغ..

بنهێر سمێلێ جەمدی

ئو دقەرسم ژ ی

زەمهەری ژ ی درێژ بوو درێژ

تو تیپی بیرا من، مینا بهارێ

تو، مینا دیاربەکرێ.

ژ چ ژ چ هێژاتر نینە

تاما بیرانیناتە..

- 3 -

ئاڤا هەمرەڤاتێ جەمدی

چار تلی جەمەد ل سەر ئاڤا تیژلە

ئەم ژ بیرێ دکشینن ئاڤا فەرەو فۆلان
چایێ ژ بەرفێ دکەلینن
دیا من وەك سر ڤەدشێرە ئێشا خوە
دبێ «بایە» بهاری دەرباس دبە .»
خوشکا من دووجانی یە ، گران
کەچك بەدەوە، تە دیتی یە
جاراپێشین هم ڤەدشێرە
هم ژ ی دترسە
دبێ ئەز دمرم
گەوری یەك دن زێدە دبن ئەم ل ڤێ زڤستانێ
بچووکێ من ، ئەز تە ل کودەرا خوە ڤەشێرم؟
خوارزیێ ئەحمە عارف
تو لەسەر سەران
سەرچاڤال تی نی . . .

- 4 -

تو هاتی دونێ
سێ رۆژان مە تو برچی هشت .
سێ رۆژان مە چچك نەدا تە .
عادیلۆشێ من
بۆ کو تو نەخوەش نەبی
بۆ کو ئەدەتا مە ئوسایە
دە هادێ، دەما چچك نوهایە
بمژ و مەزن ببە . .
ئەڤ
کۆرەمار و شەمارن
ئەڤانا
چاڤ بەردانە
نان و ئاڤێ مە
ئەڤانا ناسکە
ناسکەو مەزن ببە . .
ئەڤ ناموسە
ل کونیا مە نڤیساندی
ئەڤ ژ ی سەبر
ژ ژەهرێن نسطی یە
پێ وانا بگر
بگرو مەزن ببە . .
سێ رۆژنمان بە برسی هێشتیەوە
سێ رۆژانمان مەمك نەدایتێ
عادیلۆشی من
بۆ ئەوەی نەخوەشی نەکەوی
بۆ ئەوەی چونکە دەستوورمان وایە
دەمێیدێ ، سەروەختی مرمك ئێستایە
بمژەو گەورەبە . .
ئەمانە
کوێرەمار و شامارن
ئەمانە
چاویان بریوەتە
نان و ئاوی ئێمە
ئەوانە بناسە
بیانناسە و گەورەبە . .
ئەمە ناموسە
لە کونیەماندا نووسراوە
ئەمەیش سەبر
لە ژەهر چکاوە
خۆتیان پێدا هەڵاواسە
بگرەو مەزن بە .
ئاوی هەمرەوات مەیی
چوار پەنجە شەختە لەسەر ئاوی دیجلە
ئێمە ئاو لە بیردەردێنین بۆ دەفرو ئامان
چا لەبەفر دەکوڵێنین
دایکی من وەك سر ئێش وئازاری خۆی وەدەشێرێ
«بایە» دەڵێ . «بهار هات بە سەردەچێ» .
خوشکم دووگیانە قورس و گران
کچە جوانە دیتووتەتۆ
جاری پێشوو شەرم دەکا خۆ وەدەشێری
پاشانیش دەترسێ
دەڵێ من دەمرم

گیانێکی دی زێدە دەبێ لە ناومان ئەم زمستانە
چکۆلەکەم، من تۆ لە کێندەر وەشێرم؟
خوارزاکەی ئەحمەد عارف
تو لەسەرسەران
سەرچاڤان هانی.

- ! -

تو هاتی‌یە دنیایێ
پێم لە داودا.
بەڵام ئەوە بزانە دیسان منم
چ تووش و دژواری دەئەوینم
یەکێکی بێ زاروزمان
قەڵای دیاربەکرێ..

- 2 -

دەپشکوێ
وەك خوێنی سوور، سوورگوڵ
وە لەلایەکەوە بەفر دەبارێ
با بەرەو قەرەجەداغێ ڕادەماڵێ
بروانە سمێڵی بەستوو
وە ڕەقیش هەڵدێم
زمهرەکەی درێژەی کێشا درێژە
تۆ بە بیرم دێ‌یەوە، وەك بهارێ
تۆ وەك دیاربەکرێ
لە چ لە چ هێژاتر نیە
تامی بیرەوەریسی تۆ...

**سۆرانی**

---

تێبینی‌یەکانی لەمەر قەڵای دیاربەکرو
لۆریکی عادیلۆش.
دەستم ناگاتێ
بۆ بەی و هەناری هەروەختە گیانم دەرچێ
ملی خۆم شۆڕدەکەم، دەڕۆم

کاری تەیروتوو و مارومێروان نیە بزانن
قەت پرس مەکەن
لا ااا ل...
فەرمانی ڕەش بەسە ڕەرێیاندا بڵاوکراوەتەوە
باخچەی یار تەفروتونا
پۆروقژ بە خوێن سووردەکا
ئەوەی کە هەیە پارچەیەك گیانە
بۆ بەڵاوەگێری دەدەم
ئای نەمینم لۆوۆ..
دەستم پەتی

## میرانی سیلوان

ئەمە بەیتێکە لەو ناوچەی کوردستانی تورکیایە زۆر باوە. بە بەیت و گۆرانیش دەگێردرێتەوەو لێرەیشدا وەك بڵاوی‌دەکەینەوە کراوە بە شیعر.

### میرێن سیلوانێ

دبێن کو ئەسلێ میرێن سیلوان مەروان بوون
نەهسەد سال بەرێ حوکومدارێ کوردان بوون.
حوکوم دکرن لە فەرقین و ئامەدو دۆر
ژ روهایێ ژێر ئەردێ وان بوو حەیاژۆر
سیلوان دەشت بوو، پایی‌تەختێ وان
هەروەکی ل جیێ بلندە چاڤێ میران
فەرمان دانە کوندان، شاندن چار ئالی
هەر گوندەك ژ وان را ڕۆژەك شوخولی
هەموو گوندی، ب زارو زێچ و ژ [illegible]مێران
ب توورو کەشکەرەو تاڤرو بێران
خوەلی کشاندن دەشت، گاز کرن

سەرایەك مەزن ل سەر سازکرن
ل دۆر سەدراست کرن دارو بەر
ناڤ باژێردا بلند دبوو وەك گەوهەر
دبێن گوندەك نیڤ رۆژ کێم خەبتیيە
ئەو دێن ژی هین دبیرا تۆرنێ میران دایە .
ل بەر دەری لەشکەر، هوندور جارییە و خولام
ندەهات هەژمارتن جوتکار و شڤانێن وان .
گوندی دخەبتین، بەلەنگاز و پێخواس بوون
لێ وەخت گوهاری، سولتان هاتن، چوون
پر دەڤلەت هەلیشین، دەڤلەت چێبوون
حوکومدار بوون میر، میر بوون خزان
ئەڤ چراکا مە ل سەر میرەکی وسان . . .
دەمەك وسا هات، فەرمان ژ دەست چوو
لێ مال و ملك هین ل بن دەست پر بوو
خوارن، ڤەخوارن، گەشت و سەیران
ل مالا میران کێم نەبوو جاران
دفرۆتن پیکی ڤا، بەرێ گوندێن دوور
پاشی یێن نێزیك: گروهوردەمور . .
نەدزانین زەحمەت، نەدزانین خەبات
ژ یین زی میران را وەك جەژن و داوات
لێ رۆژەك هات، ئێدی نەما تشتێ فرۆتن
«ژ یین چ زۆرە» ب خوەو خوەرا گۆتن . . .
نە جوتکاری کربوون، نەکارکەری
نە سەناتەك زاییبوون نە تجاری
هەموو ماعریفەتێن ب دەستێ ئینسان
ژ وان دوور بوو و شەرم بوو بۆ وان . .
خزان بوون، لێ هین ناڤێ وان میر بوو
ئەڤ ناڤ ژ وان را وەك بەندو زنجیر بوو
رۆژەکی میرەك، ل مال زارو زێچ برسی
ناڤ باژێردا وەك مەجنوونان دەگەری
برچی دزانن ژ حالێ برچیتییێ . .
مەرڤ تێر نابە ب ناڤێ میرێتییێ
کر سەرێ خوە، بڤر گرت، چووژ داران
بارەك ئێزنگ ئانی، دانی ناڤ ئێزنگڤانان
ل ور کوپران دکرن و پران دفرۆشن
یەکی ژێ پرسی، «میرێ من ئەڤ بار چەند قوروشن؟»
باشتر بوو ئەرد ب قەلشت، میر بکەڤە ناڤێ
سەرێ خوە خوارکر، ب دەنگەك زراڤ
گۆت: «نا برا، ئەڤ ئێزنگ نە ب پەرانە
خوەرا بگرە ببە، ئەڤ ژ تەرا نە

## میرانی سیلوانی*

دەڵێن میرانی سیلوانێ بە ئەسڵ مەروانییانن
بەرلە نۆسەد ساڵ فەرمانڕەوای کوردان بوون
بەسەر فارقین و دیاربەکرو دەوروبەریاندا رادەگەیشتن
لە ئورفە بەرەوخوار خاکی ئەوان بوو تا بەرمۆز ووری
سیلوان پایتەختیان بوو، دەشتێکی ڕاستانە
هەر چەندە میران هەمیشە چاویان لە هەورازانە
فەرمانیان کردە سەر گوندان، بە هەر چوار لادا
هەر گوندە ڕۆژێك کاریان بۆ کردن .
گوندی، هەموو، بە زاوزاتوول و ژ ن و پیاوەوە
بە توورەکەو جەواڵ و پاچ و قوڵینگان
خۆڵیان کێشا، گردێکیان سازکرد لەو دەشتەی
کۆشك و سەرایەکیان لەسەر گردی ڕۆنا
باخ و باخچەیان لە دەوروبەر داچاند
لە ناوەندی شاری بڵیند دەبۆوە وەك دانەی گەوهەر
دەڵێن گوندێك نیو ڕۆژی کەم کارکردووە
ئەو قەرزە هێشتا لە بیری نەوەو نەتیژەی میرانداماوە
بەردەرکە ریز ڕیز سەرباز، ژوورەوە پر لە کەنیزو خولاّم
لە ژمارە زدەهاتن جوتیارو شوانی وان .
گوندی ڕەنجیان دەدا پەرێشان و پێخواس بوون
خۆیان لە کۆشك و تەلاراندا خاس و زادەگان بوون
بەلاّم ڕۆژگار گۆرا، سوڵتان هاتن، سوڵتان چوون
چەندین دەوڵەت ڕووخان و چەندین دروست بوون
فەرمانڕەوا بوون بە میر، میر بوون بە هەژار

ئەو چیرۆکەی ئێمە لەمەڕ سەرەوکاری میرێکی ئاوهایە . .
سەردەمێکی وا هات، دەسەلات لە دەست چوو
بەلام مال وسامان هێشتا لەبەر دەستدا زۆر بوو
خواردیان، خواردیانەوە، گەشت و سەیرانیان کرد
چ لە ماڵە میران کەمی نەکرد
دەیانفرۆشت پێکەوە، پێشان گوندی دوور
پاشان ئی مێزیك، بە گەورەو گچکەوە . .
نەیاندەزانی ماندوێتی، نەیاندەزانی کار
ژینیش لەبۆ میران وەك جێژن و شایی
بەلام ڕۆژێ هات، ئیتر شتی فرۆشتەنی نەما
لە دلی خۆیاندا گوتیان: «ژیان و گوزەران چەند سەختە!»
نە جوتیارییان کردبوو نە کرێکاری
نە سنعاتێکیان دەزانی نە بازرگانی
هەرچی بەهرەی دەست و بازووی نیشان هەیە
بەوان نائاشناو بێگانە، فەهێت و شوورەیی لەبۆ وان.
لێ کەوتن و بە هەژار، بەلام نێویان هەر میر بوو

ئەو نێوە لەبۆ وان وەك کوت و ز نجیر بوو
ڕۆژێ میرێکی زارۆلە لە کونی ژووری برسی
بە نێو بازاردا وەك شێتان دەگەڕا
برسی لە حالی برسی دەزانێ
مرۆ تێر مابێ بە ناوی میرێتی‌یێ
زۆری لەخۆکرد، بریاریدا، چوو بۆ داران
بارێکی دار هێنا لە مەیدانی دارفرۆشانی خست
لەوێ کە کریارو فرۆشیاری زۆری لێن
یەکێ پرسی: «میرم ئەو بارە دارە چەند قورۆش بایی‌یە؟»
چاتر بوو ئەرد قەلشیبا، میری تێ کەوتبا.
سەری خۆی شۆڕکرد، بە دەنگێکی کز
گوتی: کاکە ئەو بارەدارە بە پارە نیە
بۆ خۆتی‌بەرە، ئەویش هی تۆیە . .».
شەرمان کرد.
تۆلەی حەوت پشتمان ساندەوە
ئەگەر لە مردنی سەر کەژ وکێوان دەپرسی
ئای چەندی پێ خۆشبەختین!

صدام حسین نیشانەی لەنێزو بنیادنەری سەربلندی و سەرۆکانە لە سەرەڕێی سەرکەوتندا



# شیعرو شانۆ

نووسینی: ت. س. ئەلیوت
وەرگێرانی: فاضل قصاب

کاتێ چاوم بە بەرهەمی رەخنەیی سی ساڵی رابوردووی خۆمدا گێرایەوە - کە دووبارە نابێتەوە - تووشی ئەو زۆر لێکردنە بووم کە دەبوو بگەرێمەوە سەر باسی دراما، چ بە هەڵبژاردنی بەرهەمی هاوچەرخەکانی شکسپیر بێت، یان بە ووردبوونەوە لە توانای دوارۆژ، لەوانەیە خەڵکیی لە قسەو لێدووانم سەبارەت ئەم بابەتە بێزار بووبن، بەڵام من وای دەبینم کە بە درێژایی ژیانم خەریکی نووسینی جۆر بەجۆر بووم دەربارەی هەمان بابەت، باری سەرنجیشم پێبەپێی زۆر بوونی تاقیکردنەوەکانم هەمیشە لە گۆران و تازەبوونەوەدا بووە، تەنانەت ناچار دەبووم لە هەر قۆناغێکی تازەی تاقیکردنەوەکانمدا چاو بە هەڵوێستە نوێیەکەدا بگێرمەوە.

لەبەر ئەوەیش کە پلەبەپلە زۆر تەنگ وچەڵەمەی شانۆی شیعریو ئەو مەرجانەی پێویستە بیانهێنێتە دی، کە پاساوی بوونی ئەون، فێربووم، ئەوەم لا ئاشکرابوو نەك تەنیا هەندێ شت پاڵ بە ئارەزووی خودی خۆمەوە دەنێن بۆ نووسینی ئەم شێوەیە، بەڵکو ئەو پاڵ پێوەنەرانەش کە ئارەزووی زیاترم دەدەنێ تا ئەم شێوە نووسینە شوێن و پایەی جارانی خۆی بسێنێتەوە. باوەریشم وایە ئەگەر من ئەو تەنگ و چەڵەمەو مەرجانە روون بکەمەوە، لای کەسانی تریش ئەوە ئاشکرا دەبێت کە ئایا شانۆی شیعری لە توانایدایە ئەو بابەتە بیەخشێتە بینەر کە شانۆی پەخشان نەیتوانیوە بیبەخشێت؟

**ئەی چۆن توانای ئەو بەخشینە بە ئەنجام دەگات؟**

**پێش بینی دەکەم و دەڵێم: ئەگەر شیعر تەنیا رازاندنەوە، یان زەخرەفەیەکی زیاد بێت؛ ئەگەر شیعر، بۆ ئەو کەسانەی لە تام و چێژی ئەدەب دەزانن، تەنیا رابواردن و گوێ گرتن بێ لە شیعری جوان لەپاڵ بینینی نواندا، ئەواشیعر ئەو پێویستەیە کە شانۆ پێویستی پێی نیە.** شیعر دەبێ درامیانە خۆی بسەلمێنێ، نەك تەنیا شیعرێکی جوان بێ و خرابێتە چوارچێوەی دراماوە، بەوجۆرەی شانۆگەرییەکە خەڵکی سەرگەرم بکات و رووداوەکانی بیانهەژێنێ، یان هەڵوێستی پاڵەوانەکانی بیانجوولێنێ و هیچ ئاگاداری ئەوەش نەبن کە هۆی دەربڕینەکەی شیعرە. ئەگەر ئەوشتە ئەنجام نەدرا پێویست ناکات درامای شیعری بنووسرێت، چونکە پەخشان دەتوانێ هەموو ئەوانە ئەنجام بدات.

چ پەخشان بەکاربێنین، چ شیعر، هەردووکیان رێگایەکن بۆ مەستێك، جیاوازی نێوانیشیان ـ لەباری سەرنجێکەوە ـ وەك بزانین، زۆر گەورە نیە، خۆ لەو شانۆگەرییانەدا کە بە پەخشان نووسراون و دوای نووسەرەکانیشیان ژیاون و چەندەها نەوەی داهاتوو دەیانخوێندنەوەو لەسەر شانۆ پێشکەشیان دەکەن، ئەو پەخشانە دەبینین کە پاڵەوانەکان پێی دەدوێن و لە باشترین بەشیاندا لە پەخشانی ژیانی ئاسایی ئێمە جیاوازە، چ لە زاراوەو چ لە شیکار (اعراب)وچ لە ئیقاعیاندا. پەخشانێکە دەڵێی شیعرە، جار لەدوای جار نووسراوە. چاکترین دوو نووسەری شانۆیی ئێمە جگە لە شکسپیر و دوو ئێلیزابێسی یەکەی تر ـ 1 ـ کە شیعریان تێکەڵی پەخشان کردووە، بەرای من (کۆنجریف) ـ 2 ـ و (شۆ)ن ـ 3 ـ؛ هەردووکیشیان پەخشان دەنووسن. لێ دووانمان سەبارەت پاڵەوانێکی کۆنجریف یان برناردشۆ (هەرچەند هێڵی پاڵەوانەکانیشیان جیاواز بێت)، ئەو ئیقاعە کەسایەتی یەی دەبێت کە لە نیشانەکانی رێبازی پەخشانی هونەرییەو لە گوێ وون نابێ؛ ئیقاعێکە کەس توانای بەسەریدا ناشکێ ئەو نووسەرە نەبێ کە گفتوگۆ چاك دادەرێژێ و هەر لەبەر هەمان هۆ لە دارشتنی گفتوگۆی تەنیاشدا ـ مەنۆلۆج ـ سەردەکەوێ.

هەموویان پاڵەوانێکی (مۆلێر) مان بیستووە، ئەو پیاوەی ـ 4 ـ سەرسورمانی خۆی پیشاندا کاتێ پێیان راگەیاند کە قسەکانی لە پەخشان دەچێ. لەراستیشدا حەق بەلای (مسیۆجوردان)ەوە بوو نەك بەلای مامۆستاکەی یان خولقێنەرەکەیەوە کە مۆلێرە. ئەوبە پەخشان قسەی نەدەکرد، بەڵکو تەنیا قسەی دەکردو هیچی تر.

من دەمەوێ جیاکردنەوەیەکی سێ لایەنی لە نێوان پەخشان و شیعر و قسەی ئاساییماندا دابنێم، کە ئەمەی دواییان لە ئاستی شیعر و پەخشان دێتە خوارەوە. ئەگەرلا لەم روانگەیەوە سەیری شتەکە بکەم، ئەوا تێ دەگەم کە پەخشان لەسەر شانۆ وەك شیعر دانراوە. بە ئاڵوگۆرکردنی هەردوو لایەنی مەسەلەکەش، دەکرێ بڵێین: شیعر دەتوانێ لەسەر شانۆ ئاسایی بێ.

بینەری هەستیار دەزانێ ئەو پەخشانە جوانەی لە شانۆگەرییەکدا بەکاردێت لە پەخشانی قسەی ئاسایی چاکترە، بەڵام ئەویش بە تەواوی لەو زمانەی جیاناکاتەوە کە خۆی قسەی پێدەکا. ئەگەر ئەو سەرنجە روویدا، ئەوا دیوارێك لە نێوان خۆی و پاڵەوانانی خەیاڵ کردی شانۆگەرییەکەدا دادەنێ. بەڵام زۆرەها کەس بەرەو رووی شانۆی شیعری دەبنەوەو هەست بە جیاوازییە زمانەوانییەکەی دەکەن. لەوانەیە ئەو کەسانە ئاخ هەڵکێشن کاتێ شیعر بەردەمیان لێدەگرێ، بەڵام دڵخۆش دەبن ئەگەر شیعر توانای هەبێ رایان بکێشێ. ئەمەش وا ناگەیەنێ کە دوو جۆر چێژ وەرگرتن هەبێ، چێژێك لە شانۆگەرییەکەو ئەوای تریشیان لە زمانی شانۆگەرییەکە. بە باوەڕی من، ئەگەر کەرەسەی شانۆگەریی شیعر بێ یان پەخشان، ئیقاعەکەشیان شیعر بێت پێویستە ناشاشکرابن. لەگەڵ ئەوەشدا تێکەڵ کردنی شیعر و پەخشان لە شانۆگەرییەکدا دەبێ سەرنج رابکێشێت؛ چونکە هەر جێ گۆرکێیەك وا لە بینەر دەکا لە (هۆی دەربڕینەکە) بەئاگابێ. لەوانەیە ئارەزووی نووسەر بۆ هەژاندنی سەرنجی بینەران پاساوی جێ گۆرکێی نێوان ئەو دوو کەرەسەیەبێ، کاتێ دەیەوێ بەتوندی بینەران لەلایەکی راستیەکەوە بگوێزێتەوە لایەکەی تری. من لام وایە ئەم جۆرە گواستنەوەیە بەئاسانیی لەلایەن بینەرە ئێلیزابێسییەکانەوە

قبول کرابێ، ئەو بینەرانەی گوێیان بەشیعر و پەخشان ڕاهاتبوو، خۆبەزل زانینی پووچ و گاڵتەجاریی ئاست نزمیان لە شانۆگەرییەکدا دەبینی؛ ئەوان وایان بەچاك دەزانی پاڵەوانە ئاسایییەکان بەزمانێکی خۆماڵی و ئاسایی بدوێن، پاڵەوانە پایە بەرزەکانیش بەزمانی شیعر تەنانەت لە کاتی وڕێنە کردنیشیاندا. لەوە دەچێ ئەو پارچە پەخشانانەی شانۆگەرییەکانی شکسپیر بەجۆرێك نەخشەیان کێشرابێت کە کارتێکردنی شتە جیاوازەکان دروست بکەن. ئەوەش هیچ کاتێك بە دواکەوتوو لەسەردەمەکەمان لەقەڵەم نادرێ ئەگەر پیاوانی شانۆ لێی بزانن مادام باسی شکسپیر دەکەین، دیمەنی لەدەرگا دانەکەی (مکبث)مان دێتەوە یاد. زۆر جاریش لەشانۆگەری (هنری چوارەم)دا ئەو گۆڕانەم لا ئاشکرا دەبێ لەکەرەسەی شیعرەوە بۆ پەخشان، کە نیشانەی جیاوازیی نێوان دنیای بەرزی سیاسەت و دنیای ژیانی ئاسایییە. کەواتە ئەوەی لەبەردەمی بینەراندایە ـ وەك خۆیان تێی دەگەن ـ ئەو شانۆگەرییە مێژوویییە نیە کە لێی ڕاهاتوون و بەچەند دیمەنێکی دڵگیری وەرگیراو لە ژیانی ئاسایییەوە ڕازابێتەوە، بەڵکو ئەو دیمەنە پەخشانانە لە هەردوو بەشی یەکەم و دووەم دا کۆمەڵە پلارێکی تەوساوی دەگرنە چاوچنۆکیی سەرلێشێواوانەی سەرۆك پارتییەکان.

ئەمڕۆش شانۆی شیعری دووچاری گەلێك سەختیی هاتووە، لەبەرئەوە باوەڕم وایە کە دەبێ بەڕادەیەکی زۆر کەم پەخشان بەکار بهێنرێ. پێویستە ئامانجمان دروست کردنی شێوە شیعرێك بێ کەبتوانین بەهۆیەوە ئەوەی پێویستە بیڵێین. خۆ ئەگەر هەڵوێستێکمان هاتەڕێ و نەتوانرا بەشیعر چارەسەر بکرێ، ئەوا دیارە ئەو شێوەی شیعرەی هەڵمان بژاردووە دەستەمۆ نیە. ئەگەر ئەوەش سەلمێنرا کە ناتوانین چەند دیمەنێك بەشیعر دەربڕین، ئەوا پێویستە پەرە بە شیعرەکەمان بدەین، یان چاو لەپێشکەش کردنی ئەو دیمەنانە بپۆشین، چونکە دەبێ تا ئەورادەیە بینەر بەشیعر ڕابێنین کە بگاتە هۆشیان. لەوەش دەسڵەمێمەوە ئەگەر پەخشانە گفتوگۆیەك بخزێنرێتە شانۆگەرییەکی شیعرییەوە، ئاگای خەڵکیی لە شانۆگەرییەکەوە بگوێزرێتەوە بۆ کەرەسەی دەربڕینی.

بەڵام ئەگەر شیعرەکەمان ئەو ڕادەیە فراوان بێ بتوانێ هەموو ئەو شتانە بڵێ کەپێویستە بوترێن، ئەوسا بەدرێژایی کاتەکە شیعرنیە، بەڵکو ناشێتە شیعر تا ئەوکاتەی هەڵوێستە درامییەکە دەگاتە پلەی چڕبوونەوە، لەوکاتەدا شیعر دەبێتە مەنتیقێکی سروشتیی چونکە تەنیا زمانە کە بتوانرێ لەڕێگایەوە هەڵچوونەکان دەربڕێت.

بەڕاستی پێویستە هەموو هۆنراوەیەکی درێژ ـ گەر بیەوێ لە وشکی و بێزارکردن دوور بکەوێتەوە ـ بتوانێ بەبێ زۆرە ملێ شتە ئاسایییەکان بڵێ. هەروەها پێویستە بگاتە بەرزترین ئاسۆ بەبێ زیادپێوەنان؛ ئەوەش لەشانۆگەریدا زیاتر گرنگە بەتایبەتی ئەگەر پەیوەندی بەژیانی هاوچەرخەوە هەبێ.

نووسینی ئەو بەشەی زۆرتر پەخشانی دەوێ لەشانۆگەرییەکی شیعریدا بەشیعر نەك بەپەخشان تەنیا بۆ ئەوە نیە سەرنجی بینەران لە کەرەسەی دەربڕین لابدات، بەڵکو ئیقاعە شیعرییەکەش کار لەگوێگران دەکا بێ ئەوەی لێی بەئاگابن. شیتەڵ کردنەوەیەکی کورتی یەکێك لە دیمەنەکانی شکسپیر ئەو خاڵە ڕوون دەکاتەوە؛ با نموونەکەشمان دیمەنی سەرەتای دەست پێکردنی (هاملێت) بێت وەك دیمەنێکی بنیات پتەو کە هەموو کەسێك دەیزانێ.

کاتێ ئەو دیمەنە لەسەر شانۆ دەبینین، هەست بەو گۆڕانکارییە گەورەیە ناکەین لە شێوازدا. ئاشکراشە کە دێڕە شیعرێکی زیا لە پێویست نابینین، یان دێڕێك کە نرخە درامییەکەی خۆی نەسەلمێنێ. ئەو بیست و دوو دێرەی یەکەم لە ئاسان ترین وشەو ئاسایی ترین جۆری ڕستەدانان بنیات نراون. شکسپیر جۆرەها کاری چاکی نووسیوەو ماوەیەکی زۆریش لە شانۆدا کاری کردووە پێش ئەوەی بگاتە ئەو ئاستەی بتوانێ ئەو بیست ودوو دێرە بنووسێت؛ هیچ شتێکی تا ئەوڕادەیە هێمن و ئاسان کراو و دڵنیاش لەکارەکانی ڕابوردوویدا نیە. پێشان گفتوگۆیەکی شیعریی باوی لە مەنۆلۆجی پاڵەوانێکدا دروست دەکرد، وەك (فۆلکنبریدج)ی (پادشا جۆن) یان (دایەن)ەکە لە (ڕمیۆ جولێت)دا. بەڵام هەنگاوە تازەو دوورەکەی ئەوەیە بەبێ زۆرەملێ، لەپەناوە،

ئەو مەنۆلۆجە تێکەڵی گفتوگۆیەکی زیندووو دەکا کەبریتی یە لە چەند کورتە وەڵامێك شاعیر توانای تواناى بەسەر شیعری درامیدا ناشکێ هەتا نەتوانێ دێری کورت و ناسك بنووسێ وەك ئەوانەی لەسەرەتای (هاملێت)دا دەیان بینین . تۆ ئەوکاتە بەهۆشەوە ئاگات لە کەرەسەی شیعر نابێ بەڵکو ئاگات لە مانای شیعرەکە دەبێ، هەرچەندە یەکەم جاریشت بێ هاملێت بینیو هیچیش لەچیرۆکەکەی نەزانیت .

باوەڕناکەم بە بیرت دا بێو بپرسیت . ئایا قسەکەرەکان شیعر دەڵێن یان پەخشان؟ هەرچەندە شیعر بەپێچەوانەی پەخشانەوە کارمان تێدەکا، بەڵام ئێمە لەم کاتەدا ئاگامان لەشەووسەرماکەیو لەو ئەفسەرانەیە کە پاسەوانیی شورای قەڵاکە دەکەن، بەڵکو چاوەڕێی رووداوە بە سامەکەش دەکەین . . ناڵێم مەودای ئەوە نیە کە بەشێك لە خۆشیی بینەر چێژ وەرگرتن بێ لەشیعری جوان، بەڵام دڵنیام کە شاعیر لەپێناوی مەسەلەیەکی درامیدا دەیخاتە ئەم شوێنەوە . ئێمەش - بێگومان - دوای ئەوەی چەند جارێك شانۆگەرییەکەمان بینیو چەند جارێکیش لە نێوان نمایشە جۆربەجۆرەکانیدا خوێندمانەوە، دەکەوینە شیتەڵ کردنی ئەو رێگایانەی بەهۆیانەوە نووسەر توانیویەتی کارمان تێبکا، بەڵام بە بەرەنگاربوونی خێراو بە پەلەمان بۆ ئەم دیمەنە ناتوانین ئاگاداری کەرەسەی دەربرینی بین .

لەسەرەتای دیمەنەکەوە ئەو یەك دوای یەکتر کەوتنە گونجاوەی هەڵوێستەکەو پاسەوانەکان دەبینین، بەڵام دوای ئەوە هیچ لەکەسایەتی کارەکتەرەکان ئاشکراناکرێت زیاتر لەوەی لەچیرۆکەکەدا پێیان سپێردراوە . ئینجا شیعر لەبزووتنەوەیەکی هێدیدا، لەگەڵ دەرکەوتنی پاساوانان : هۆراشیۆو مارسیلیۆس دا هێمن دەبێتەوە .

هۆراشیۆ دەڵێ : «ئەوە، لەخەیاڵی خۆمان بەولاوە شتێکی تر نیە» جارێکی تریش بزووتنەوەکە لەگەڵ دەرکەوتنی تارمایی پادشادا بەهێمنیو قووڵییەکی کوت وپڕەوە دەگۆڕێ :

«تۆچیت ئەی ئەو کەسەی ئەم بەشەی شەوت زەوت کردووە؟» .

بەو بۆنەیەوە سەرنج لەو پێش بینییە بدە بە (گرێ) کەوە کە کرداری (زەوت کردن) روونی دەکاتەوە . بەڵام دەست نیشان کردنی پادشا دوای ئەوە ئاشکرا دەبێ تابزانین ئەوەی دەرکەوتووە تارمایی کێیە!

«بەو جۆرە، جارێکیان لە تووڕەبوونێکدا رووی خۆی گرژ کرد» .

«کە لە کاتی بەفرخلیسکێدا کەوت بەسەرسەری بۆلۆنیدا» .

دوای ئەوە، ئەو نەغمە پچڕپچڕەی ووشەکانی هۆراشیۆ دەبیستین ئاراستەی تارماییەکەی دەکا کە بۆجاری دووەم دەردەکەوێ :

«بەڵام، بێدەنگیی، سەیرکەن، وا دووبارە دێتەوە
ئەگەر تێکیشم بشکێنێ بەرەنگاری دەبمەوە، بووەستە ئەی تارمایی .
(تارماییەکە باڵەکانی بڵاودەکاتەوە)
ئەگەر دەنگ و دووانت هەیە بیدرکێنە
قسەم لەگەڵ بکە
ئەگەر چاکەیەك شك دەبەی بیکە
حەوانەوە بدا بە خێریش بە من
قسەم لەگەڵ بکە
گەر ئاگاداری شتێك هەیت قەدەر لە نیشتمانەکەتی شاردبێتەوە پێشەکی دەتوانین خۆمانی لێ لادەین گەر ئێمەش بیزانین .
قسە بکە . . .
یان لەرۆژانی ژیانت دا مالی حەرامت داگیرکردووەو لە ورگی زەمیندا حەشارت داوە لەبەرئەوەیە کە دەڵێن، ئێوە کۆمەڵە گیانێکن دوای مردن دەسووڕێنەوە ئاگادارم بکە .
بووەستە، بدوێ، مارسیلیۆس بیوەستێنە» .
(کەڵەشێرەکە دەخوێنێ) .

ئینجا بۆجاری دووەم ئەو ئیقاعە لەگەڵ ووشەکانی مارسیلیۆس دا دەگۆڕێ : «خراپەی لەگەڵ دەکەین کە بە توندی بەرەنگاری دەبینەوە .

ئەویش بەورادەیە شکۆدارە
دەڵێی هەوایە، تیری لێنادرێ

هەر تیرێك بهاوێن بێهوودەیە، بەڵكو گاڵتەجارییشە»
هەڵوێستەكە لەگەڵ ووشەكانی مارسیلیۆس دا دەگاتە لوتكە:
«لەگەڵ خوێندنی كەڵەشێرەكەدا رەوی‌یەوە
هەندێ كەس دەڵێن، كاتێ وەرزی جەژنی لەدایك بوونی دڵسۆزەكەمان دێت، باڵندەكەی بەربەیان بەدرێژایی شەو دەخوێنێ».
هۆراشیۆ وەڵام دەداتەوە:
«منیش بیستوومە، باوەڕ بە هەندێكیشیان دەكەم
بەڵام بنوارە، ئەوە بەرەبەیانە بەرگی وەنەوشەیی پۆشیوەو هەنگاو بەسەر ئاورنگی ئەو تەپۆڵكەیەدا دەنێ كە لەخۆرهەڵاتەوە؟ بەرز بۆتەوە.
با دەست لەپاسەوانی‌ی هەڵگرین».

ئەمە شیعرێكی بەرزە، هەروەها شیعرێكی شانۆیی‌یە، سەرەڕای ئەوە لەو دوو رادەیەش گەورەترە. ئەگەر شیتەڵیان بكەینەوە دەبینین جۆرە نەخشەیەكی مۆسیقای ئاراستەكراوی تێدایە كە لە هەمان كاتدا لەگەڵ بزووتنەوە شانۆیی‌یەكەدا یەك دەگرنەوە. ئەم نەخشەی مۆسیقایە لەگەڵ تێپەڕبوونی كاتدا سۆزمان ووریا دەكاتەوە بێ‌ئەوەی هەست بە بوونی بكەین. با ئاگاداری ئەومش بین، لەو ووشانەی دوایی مارسیلیۆس دا لەوە دەچێ شیعر كەم دەربكەوێو هۆشی بینەریش دركی پێبكات. بەڵام كە گوێمان لەم دوو دێرەی هۆراشیۆ دەبێ:

«بەڵام، بنوارە، ئەوە بەرەبەیانە بەرگی وەنەوشەیی پۆشیوەو هەنگاو بەسەر ئاورنگی ئەو تەپۆڵكەیەدا دەنێ كە لە خۆرهەڵاتەوە بەرزبۆتەوە» شیعر خەریكە لەئاستی كارەكتەرەكە بەرزمان بكاتەوە، بێ ئەوەی هەست بە نەگونجاندنی ئەو ووشانە بكرێت كە پاش ئەوە لە دوو لێوی هۆراشیۆوە دەوترێن. گواستنەوەكانی ئەو دیمەنە دوای پاساكانی مۆسیقای شیعری شانۆیی دەكەون. با تێ‌بینی ئەومش بكەین، ئەو دوو دێرەی هۆراشیۆ دەیاڵێ «بەڵام، بنوارە. . »، دێرە قسەیەكی ئاسان پێشیان دەكەوێ كەرەنگە نە شیعر بێو نە پەخشان.
«منیش بیستوومە، باوەڕ بە هەندێكیشیان دەكەم»
دوابەدوای ئەویش كورتە دێرێك دێت كە بریتی‌یە لە ئاراستە كردنێكی شانۆیی‌و هیچی‌تر:
«بادەست لە پاسەوانی‌ی هەڵگرین»

خۆشترە ئەگەر بەو رەنگە بەردەوام بین لەسەر شیتەڵ كردنەوەی مەسەلەی بوونی دوو نەخشەی شانۆگەری شیعری‌ی پایەبەرز، یەكەمیان نەخشەی مۆسیقایە، دەتوانین ئەوی تریشیان لەباری سەرنجی پیشەیی شانۆوە دەست نیشان بكەین. بەڵام من باوەڕم وایە كە لێكۆڵینەوە لەو تەنیا دیمەنە بەسە بۆئەوەی بزانین كە شیعر تەنیا رازاندنەوەو چوارچێوە نیە بەڵكو چڕبوونەوەی دراماكەیە. هەروەها ئەم لێكۆڵینەوەیە بایەخی ئەو كارتێكردنەی شیعر ئاشكرا دەكا كەبینەر دركی پێناكات؛ ئەو كارتێكردنەی نەك تەنیا ئەوانەی شیعریان خۆش دەوێ هەستی پێدەكەن بەڵكو ئەوانەش كە شیعریان خۆش ناوێ، مەبەستم ئەو كەسانەیە كە ناتوانن بەدیار دیوانە شیعرێكەوە دانیشن و بیخوێننەوە. ئەوانەش ئەو خەڵكەن كە دەبێ نووسەری شانۆگەری شیعری‌ی حیسابیان بۆبكات.

لێرەدا وا چاكە رایەك سەبارەت ئەو شانۆگەری‌یانە بڵێم كە بە (شاعیری‌ی) ناویان دەبەین هەرچەندە كە بەپەخشان نووسراون. شانۆگەری‌یەكانی (جۆن ملنجتۆن سنج) ـ 5 ـ حاڵەتێكی تایبەتی‌یە، لەبەر ئەوەی بەزاراوەی خەڵكی گوندەكان بینا كراون كە قسەكردنیان سروشتیانە شاعیری‌یە، چ لە وێنەو چ لەئیقاعدا. وابزانم سنج چەند برگەیەكی تێهەڵكێش كردووە كە لە دێهاتی‌یە ئێرلەندی‌یەكانی بیستوون. زمانی سنج تەنیا لەو شانۆگەری‌یانەدا بەتوانایە كە رووداوەكانی لەناو ئەو جۆرە خەڵكەدان. ئەگەر سەیرێكی ئەو شانۆگەری‌یانە بكەین كە بەپەخشان نووسراون و لەسەردەمی لاوێتیمدا خەڵكی‌ی گەلێك پێیان سەرسام بوون و ئێستاش كەمتر دەخوێندرێنەوە. ئەتوانین بگەینە سەرئەنجامێكی گشتی‌ی. ئەوانە شانۆگەری‌یەكانی (ماترلنگ)ن ـ 6 ـ ئەم شانۆگەری‌یانە بەجۆرێكی تایبەتی لە بابەتەكانیاندا پەنگیان خواردۆتەوە؛

راستیش نیە كەدەڵێن كارەكتەرەكانیان تاریك وێنەیان كێشراوە، نكوولی لەوەش ناكەم كەچەند نرخێكی شیعری‌یان

هەیە. بەلام بۆئەوەی نووسەری شانۆیی لە پەخشانەکەیدا شاعیری بێت، دەبێ هەمیشەو بەبێ بچڕان شاعیری بێت.

سنج، چەند شانۆگەرییەکی سەبارەت کەسانێك نووسیوە کە قسەی ژیانی رۆژانەیان شاعیرییە، لەبەرئەوە توانیویەتی وایان لێبکات بەشیعر بدوێن و کەسانی راستەقینەش بن، بەلام ئەو نووسەرە شانۆییەی ئەم سیفەتە شك نابات پێویستە لەوە زیاتر شاعیری بێت.

(ییتس) - 7 -، لە ماترلنگ و سنج جیاوازترە. لێکۆڵینەوەش لە پەرەسەندنی شانۆیی ئەو، پەردە لەرووی ئەو رێگە دوورە لادەدا کە بڕیویەتی، ئەو سەرکەوتنانەش ئاشکرا دەکا کە لەشانۆگەرییەکانی دواییدا بە دەستی هێناوە. لەسەرەتای ژیانیدا چەند شانۆگەرییەکی دەربارەی ئەو بابەتانە نووسیوە کە دەکرێ وەك بابەتی شیعر وەربگیرێن، کێشتیکی (عروضی)یان هەبووە کە تەنیا شایستەی پادشاو شازنانی ناو داستانەکان بێت. شانۆگەرییە مام ناوەندییەکانیشی (شانۆگەرییە بۆ سەماکەران) تابلۆی جوانن بەلام چارەسەری هیچ لەو گیروگرفتانە ناکەن کە دووچاری نووسەری شانۆیی دەبن. ئەو شانۆگەرییانە بە پەخشانێکی شاعیرانە نووسراون و هەندێ جێپەنجەی جوانی شیعریان تێدایە.

ییتس نەیتوانی گیروگرفتی گفتوگۆی شیعری چارەسەر بکات هەتا دوا بەرهەمی شانۆیی خۆی کە (پاکژگە)ە بەوەش چاکەی لەگەڵ هەموو ئەو کەسانەی دوای خۆیدا کرد.

1 - مەبەستی (کریستۆفەر مارلۆ)و (بن جۆنسۆن)ە.

2 - (ولیم کۆنجریف) 1670 - 1729 نووسەرێکی شانۆیی ئینگلیزی بەناوبانگە، لە شانۆگەرییەکانی: خۆشەویستی بەرامبەر خۆشەویستی دنیا بەوجۆرە دەروا.

3 - (برناردشۆ) 1856 - 1950 لە شانۆگەریەکانی: قوتابی شەیتان، ئەندرۆکلیس و شێرەکە، بجمالیون، سیزارم کلیوباترە، ماڵی دڵ شکاوان.

4 - (مسیو جۆردان) کارەکتەرێکە لە شانۆگەری (بۆرژوا)ی مۆلیێردا. ئەم پیاوە سامانێکی کۆکردەوە، ویستی رێگای پیاوماقولان بگرێتە بەر مامۆستایەکی شمشێربازیو مامۆستایەکی رەوانبێژیی راگرت، کاتێ مامۆستای رەوانبێژی ئاگاداری کردەوە کە قسەکردن لە شیعر و پەخشان پێك دێت، جۆردان سەری سوڕما، چونکە بەدرێژایی ژیانی بە پەخشان قسەی کردووەو پێی نەزانیوە.

5 - (جۆن ملنجتۆن سنج) 1871 - 1909 نووسەرێکی شانۆیی ئیرلەندییە لە شانۆگەرییەکانی: سێبەری دۆڵەکە، هەموویان کورمن، نرخ، کاتێ مانگ ئاوابوو.

6 - (مۆریس ماترلنگ) 1862 - 1949 شاعیر و نووسەری شانۆیی بەلجیکییە بە فەرەنس دەینووسی ساڵی 1911 خەڵاتی (نۆبڵ) پێدرا، لە شانۆگەرییەکانی: شازادەمالین - کوێرەکان - ئەچلافین و سیلیست.

7 - (ولیم ییتس) 1865 - 1939 ئیرلەندییەو پایە بەرزترینی ئەو شاعیرانەیە کە بەئینگلیزی دەنووسن.

* - ئەم ووتارە، یەکێکە لە نووسینە رەخنەییەکانی (ئەلیوت) کە شاعیری پایەبەرزی عەرەب (صلاح عبدالصبور) لە کۆمەڵە ووتاری (پەخشانە هەڵبژاردەکان)ەوە وەریگرتووەو کردوویەتی بەعەرەبیی و لەپێشەکی شانۆگەرییە شیعرییەکەی ئەلیوت دا (تاوانێکی کوشتن لە کاتدرائیەکەدا) کە وەرگێڕاوە بلاوی کردۆتەوە. ئەم ووتارە ئاشکراترین بەیاننامەی بزووتنەوەی شانۆی شیعریی ئەلیوت و شانۆی شیعریی هاوچەرخە.

**** هەموو شتێك لە پیناوی***
***سەرکەوتندا***

# لاتینی چی یە؟

● عومەر دزەیی ●

كەس نی یە لە كوردەواری نەزانیّ تەلەفۆن، تەلەڤیزیۆن، رادیۆ، ئەلەكتریك، ئۆتۆماتیك، ئۆتۆمۆبیل، بایسكل، مۆتۆرسایكل، فۆتۆگراف، تەلەگراف چین. بەلاّم زۆرن ئەوانەی كە نازانن ئەم وشانە هی چ زمانەكن. ئی وا هەیە وا دەزانیّ ئینگلیزین، هەشە بە عەرەبی دەزانیّ، رەنگە هەندەكیش بەكوردیەكی پەتی تیّ بگەن. چینی هۆشیار (الطبقة الواعیة)ی لیّ بترازیّ، زۆربەی خەلّكە كە نازانیّ ئەم وشەو زاراوانە یان لاتینین یان گریكین، یانیش تیّك هەلّكیّشراوەكی ئەودوو زمانەن.

زۆرجار كورد باسی «كوردی لاتینی» دەكەن بیّ ئەوەی بزانن لاتینی چی یە.

جا لەبەر ئەو كەلیّنە گەورەیەی كە لە پەروەردەی كولتووری (كولتووریش هەر لاتینی یە) كوردان دا بەدی دەكریّ، بەپیّویستم زانی وتارەكی بچكۆلە بۆ خوێنەری كورد بنووسم و تیّ یدا ئەم «لاتینی»یەی بەكورتی و پوختی بۆ روون كەمەوە.

خۆی وشەی «لاتینی ـ Latin» لە وشەی «لاتیوم ـ Latium» ەوە هاتوە كە ئەمەشیان ناوی هەریّمی ناوەراستی ئیتالیا بوە كە شاری «روما»ش دەگریّتەوە ئەوسا «روما» پایتەختی «لاتیوم» بوە.

ئەم دیاردەیە، واتا ناوی زمانەك بەناوچەكەیەوە بندریّ، لە زۆر جیّگای دیكەش هەبوە. هەریّمی ناوەراستی ئیسپانیا پیّ یدەگوترا ـ وپیّش دەگوتریّ ـ «كاستیلیا»، ئەوساو ئیّستەش زۆرجار لەباتی زمانی ئیسپانیانی ـ خەلّك دەلّیّن «كاستیلیانی Castillano»؛ یان لە ئەلّەمانیا بەتەنها تاكە تیرەیەك، پیّ یان دەلّین «ئەلّەمانن ـ Allemanen» كەچی ئیّستا بەهەموو ئەلّەمانیا دەگوتریّ «ئەلّەمانیا». لە كوردستانیش دا، كوردی ژووروو بەزمانی كوردی دەلّین «كرمانجی» چونكە خۆیان كوردی كرمانجن. هەرچۆنەكی بیّ، با زۆری لەسەر نەرۆین، «لاتیوم» هەریّمی دەورووبەری شاری رۆما بوە. خەلّكی ئەو هەریّمە، كە ئیّمە ئەمرۆكە پیّ یان دەلّیین «رۆمانە كۆنەكان»، بەولاّت خۆیان بە شاری رۆما ـ واتا رۆمانی ـ بەزمانیش خۆیان بە ناوی هەریّمەكە ـ واتا لاتینی ـ دەناساند. جا هەر لەبەر ئەوەشەكە هەلّە نی یە ئەگەر پیاو هەندیّجار لەباتی «لاتینی» وشەی «رۆمانی» بەكار بیّنیّ و بەرەواژەكەشی هەر راستە.

ئاشكرایە كە گەلی رۆمانی كۆن Populus Romànus گەلیّكی ئازاو بەكار بووین و توانیویانە، بەرەبەرە، دەست بەسەر هەموو ئیتالیاو بەشی هەرە زۆری ئەورووپاو بەشیّكی رۆژهەلاّتی ناوەراست و باكووری ئافریكاش دابگرن. سەبارەت بە شارەزایی و وەستایی بیّ هاوتایان لەهونەری دەولّەت دامەزراندن و فەرمان رەوایی، توانیان ئیمپەراتۆراتیەكی پان و بەرین Imperium Romànum دابمەزرینن. زمانی لاتینی ـ ئەمیش بەنۆرەی خۆی ـ وەك ئاگری ناوپووش خۆی كشاندە سەرانسەری ولاّتی رۆمان.

یەكیّك لەبەرهەمە هەرە گرنگەكانی بیری تیژی رۆمانەكان و زمانە زەنگین و سەنگینەكەیان «رەوای رۆمانی ـ ius Ròwanum» بوو كە كارەكی گەورەی لەناو كۆمەلّگەی پاشتری ئەورووپادا هەبووو ئیّستاش لە هەموو زانكۆیەكانی جیهان دا بەكۆلّەگەی سەرەكی بناغەی خویّندنی رەوا (حقوق) دەژمیّردریّ.

هەڵبـەتـا ئەمـە هەمـووی پێش وەدەرکەوتنی خریستیانەتی بوە. هەر کە ئەم ئایینـە پەیـدابـوو، پەیـامی یەزدانیش هەر بەلاتینی گەیێندرا بەوگەل و میللەتانەی کە ئیمپەراتۆراتیەکەیان لێوە دروست کرابـوو. بەم جۆرە کلیسـەی مەسیحـایی بوو بە میراتگری ڕومانەکان لە مەیدانی ئایینەوە.

لەگـەڵ سەرنگـون بوونی ئیمپـەراتـۆراتی ڕۆمانی، زمانی لاتینیش هەرەس هانی. لەوەوە چەنـد زمـانەکی جۆربەجۆر ـ بەڵام لێـك نزیـك ـ پەیـدابـوون و جێگـاکـەیـان گرتـەوە: ئیتـالیـانی، ئیسپـانیـانی، پۆرتـوگیـزی (زمـانی پۆرتوگال)، فرانسەیی و ڕومانی (زمانی ولاتی ڕۆمانیای ئێستا). ئەم زمانانە ئەمـرۆکـە هەم بە «کـۆمەڵە زمانی ڕۆمانی» هەمیش بە «کۆمەڵە زمانی لاتینی» ناودەبردرێن. ئەم کۆمەڵە زمانە ڕۆمانی‌یە، یان لاتینی‌یە، پێکـەوە لەگـەڵ زمـانـە سلاڤیـەکـان (واتـا هەموو ئەورِ وپـای سۆشیـالیـست، هەنگاریانی و ئەلبانیانی و ئەڵمانی لێ‌دەرچێ)؛ لەگـەڵ کۆمەڵە زمانە گێرمانیەکان (واتا ئەڵمانی و زمـانی ولاتـە سکـەنـدینـاڤیەکان، فینلەندیانی لێ‌دەرچێ)؛ لەگـەڵ ئینگلیـزی کە تێکـەڵـەیـەکی ساکسـۆنی و لاتینی و گیرمانی‌یە؛ لەگەڵ کۆمەڵە زمانی ئێرانی (واتا فارسی و کوردی و بلوچی و پشتکـو..) لەگەڵ کۆمـەڵـە زمـانی هینـدی (واتـا هینـدی و ئوردوو بەنـگـالی و... هەمـوو زمـانـەکـانی هینـدوستـان)؛ لەگەڵ گریکی و ئەلبانی و ئەرمەنی، هەموویان پێکەوە خێزانی زمانە ئینلو ـ ئەوروپاییەکان پێك دێنن.

جا، لەبەر ئەمە، ئەو هەموو زمانانەی باسمان کردن خزمن و بەرەگ و پێـك دەگـەڕێنـەوە سەریـەك پشت. بەڵام هەروەك گوتمـان، بووین بەکـۆمـەڵ کۆمەڵ یان تیرە تیرە کە خزماتی ناو یەك تیرە، هەڵبەتا، توندترە لە خزماتی نێوان تیرەوتیرە.

لە تەمـەنـە ناوەنـدی‌یـەکانەوە تادرەنگیش «لاتینی»؛ زمانی کلیسەو خوێندنخانەو زانیاری و کاروباری دەوڵەت بوە.

ئەمـرۆکـەش لەکلیسـەی کاتۆلیك ی ڕۆمانی هەر بە لاتینی نوێژ دەکرێ و پەیام و وتەکانی «پاپا»ش هەر بەو زمانەن. بەڵام وەك زمـانی میللەتەك، ئێستا لاتینی نەماوە. ئینجا، سەبارەت بە پێکچـوونی زمـانـە ئەوروپاییەکانی ئەمرۆ لەسەریکەوە، وە سەبـارەت بە دەوڵـەمەندی‌ی زمانی لاتینی، لەسەریکی کەوە، دەبینین کە وشـەو زاراوی زانیـاری و پزیشکی و دەرمـانگەری، بەتایبەتی، لەهەموو جیهان دا هەر بەلاتینی ناو دەندرێن.

جا لەبـەر تیشکی ئەم ڕوون کردنـەوەیـەش، سەیـر نی‌یـە ئەگـەر جاروبـار هەنـدێ وشـەی لێـك نزیکمـان لە کوردی و لاتینی‌دا کەوتنە بەرچاو وەك:

| | | |
|---|---|---|
| نەتەوە | natio | (ناتیۆ) |
| بەر | Prae | (پرێ) |
| چوار | Guattuor | (کواتوۆر) |
| نا، نۆ | non | (نۆن) |
| نە(پێشگری‌نە یاندن) | ne | (نێ) |
| دان | dono | (دۆنۆ) |
| پەڕ (پەڕینەوە، تێ‌پەڕبوون) | Per | (پێر) |
| نووکە (هەنووکە، ئێستاکە) | nunc | (نونك) |
| کوو (چۆن)؟ | Guam | (کووام) |
| توو (تۆ) | ùt | (توو) |
| ڕەگ | Origo | (ئۆریگۆ) |
| پێ | Pès | (پێس) |
| مان (مانەوە) | Maneo | (مانێو) |
| دێو (خوای‌پێش داهاتنی ئایین) | deùs | (دێوس) |
| دەبێ (پێویستە) | dèbeo | (دێبێوۆ) |
| کەینێ (کەی)؟ | guando? | (کواندۆ)؟ |
| پشت (پاش) | Post | (پۆست) |
| نوێ | novus | (نۆڤوس) |
| دوو | duo | (دوو) |
| مرد | mortuus | (مۆرتوس) |
| ئەوێ | òe | (ئێوۆ) |
| سەت (صەد) | centum | (سێنتۆم) |

بۆنموونە، بائەوەندە بەس بێ. زۆری تریش هەن و تەنانەت لە ڕێزمانیش دا هەندێ پێکچوون بەدی دەکرێ.

**ئەلفوبێی لاتینی ABC**

ئەو ئەلفوبێ یەی کە ئەمڕۆکە زۆربەی هەرەزۆری زمانە ئەوروپاییەکان، ئەوانەی ئەمەریکاو زۆر زمانی تریشی پێ دەنوسرێن، هەمان ئەلفوبێ یە کە لە کاتی خۆیدا ڕۆمانە کۆنەکان دایان ناوە. وەك زمانەکەیان ئەلفوبێ یەکەش پێ ی دەگوترێ «لاتینی» یان «ڕۆمانی». کەواتە، ئەگەر ئەمڕۆکە کوردەك ABCی بەرچاو کەوت نابێ بڵێ ئەم پیتانە ئینگلیزین یان فرەنسەیین یان ئەڵمانین یان... یان... یان.

ڕاستە هەر میللە تەوبوخۆی، بەگوێرەی سروشتی زمانەکەی خۆی ئەو ئەلفوبێ یە لاتینی یەی دەسکاری کردوە. حەوت و هەشت و چوکلەی سەروژێری بۆ داناوە، یا دوو- سێ پیتی خستۆتە پاڵ یەك بۆئەوەی ببنە نیشانەی دەنگەك کە لە زمانەکانی تردا نی یە، بەڵام ئەو دەسکاری یە ڕاستی یەکە ناگۆڕێنێ کە، بەڕەسەن، ئەلفوبێ یەکە هەر لاتینی یە. بەهەمان پلە، کوردەك یان فارسەك یان پاکستانی یەك با سەروژێریشیان بۆپیتی عەرەبی دانابێ تا لەگەڵ سروشتی زمانەکەیانی بگونجێنن، ئەو ئەلفوبێ یەی پێ ی دەنوسن بەڕەسەن هەر عەرەبی یە زۆر میللەتی دیکەش هەن کە پێشان زمانەکەیان بەپیتی عەرەبی دەنوسی کەچی وایان بە بەرژەوەند زانی بیگۆڕنە سەر لاتینی چونکە بەلایانەوە باشتر دەگونجێ، وەك تورك وکوردی تورکیا و کوردی سوریا.

بەکورتێ پێویستە بزاندرێ کاتێ کە یەکێك دەڵێ (کوردیلاتینی) مەبەس ئەوەیە (زمانی کوردی بەپیتی لاتین نوسراو) بە پێچەوانەی (زمانی کوردی بەپیتی عەرەبی نوسراو)

**ژمارەی ڕۆمی:**

زۆر سەعاتی کۆن، بەتایبەتی ئەوانەی کە بەزریزە لەباخەڵ قایم دەکران و قەپاخیان هەبوو، ژمارەکانی ناوەوەیان 12345 نەبوون بەڵکو ئەئاوا نوسرابوون: V IV III II I.
خەڵکی بەمەیان دەگوت ژمارەی ڕۆمی. ئەلحەقا، ئەمەیان ڕاست کردوە.

وەك زمان، وەك ئەلفوبێ، ڕۆمانە بەدەسەڵات و بیرتیژەکان ژمارەی تایبەتیشیان بۆ خۆیان دانابوو. ئێستەش ئەوەی بچێتە ئەوروپا لەسەر دەروازەو دیوارە جوانەکانی کۆشك و کلیسەی باڕۆك و ڕێنێسانس دا هەر تاریخی ڕۆمی بەرچاو دەکەوێ؛ ئێستەش بۆ ڕێك خستنی بەندو بەشەکانی نامیلکەو کتێبان زۆرجار ژمارەی ڕۆمی بەکاردێ کە بەم جۆرەیە:

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| I | II | III | IV | V | VI | VII |
| 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 |
| VIII | IX | X | XI | XII | XIII | XIV |
| 8 | 9 | 10 | | 12 | 13 | 14 |
| XV | XVI | XVII | XVIII | XIX | XX | |
| 15 | 16 | 17 | 18 | 19 | 20 | |

سەرنج (1): (یەك)و(پێنج)و(دە)و(پەنجا)و(صەت)و(پێنج صەت)و(هەزار)، ئەمانە ژمارەی سەرەکین و نیشانەی تایبەتیان بۆداندراوە. نووسینی هەموو ژمارەکانی تر بە لێکدانی ئەم ژمارە سەرەکیانە پێك دێت.

سەرنج (2): هەر ژمارەیەك لەلای ڕاستی ئەم ژمارە سەرەکیانە بوو ئەوە گەورەی دەکا، هەر ژمارەیەکیش لەلای چەپی ئەم ژمارە سەرەکیانە بوو بچووکی دەکاتەوە.

سەرنج (3): ئەو دوو هێڵە چکۆلانەی بە شێوەیەکی ئاسۆیی بە سەروژێری ژمارەکانەوەن، پەیوەندیان بە ژمارەوە نی یە، تەنها وەك چوارچێوە داندراون، تا بزاندرێ کە ئەو ژمارانەی کە تونەتە نێوان دوو هێڵەوە، بەیەك نومرە دادەندرێن. مەرجیش نی یە دابندرێن.

**ژمارە سەرەکیەکان:**

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| I | V | X | L | C |
| 1 | 5 | 10 | 50 | 100 |
| D | M | | | |
| 500 | 1000 | | | |

دەبا تافی ی بکەینەوەو ژمارەی (3) بنووسین . ئەمەیان بریتی یەلە 3 دانە (یەکی) بچکۆلە بەتەنشت یەکەوە (III) .

بۆ نوسینی ژمارە (4) ژمارە سەرەکیەکەی (5) دەنوسین و (یەکێکی) دەخەینە لای چەپی بۆ ئەوەی یەك دانە کەم بێتەوە وببێتە (4) بەم جۆرە:

IV.

بۆ نوسینی ژمارە (6) ژمارە سەرەکیەکەی (5) دەنوسین و (یەکێکی) دەخەینە لایڕاستی بۆ ئەوەی یەك دانە گەورەتر بێ و ببێتە (6) بەم جۆرە:

VI.

ژمارە (9) بە نوسینی ژمارەی سەرەکی (10)و یەکێکی چەپیەوە پێك دێ بەم جۆرە: IX ژمارە (11) بەنوسینی ژمارەی سەرەکی (10)و یەکێکی ڕاستیەوە پێك دێ بەم جۆرە؛ XI ژمارە (20) لە دوو دانە ژمارەی سەرەکی (10)ەوە پێك دێ، بەم جۆرە؛ XX

ئێستا، کە فێربووین (10) و (9) بنووسین، بەئاسای دەتوانین (19) بنوسین . (نۆ)یەکە دەخرێتە لایڕاستی (دە)یەکە، بەم جۆرە XIX (چل) نووسین بەم جۆرە دەبێ .

لەپێشان دا (L ـ 50) دەنووسین، دوایێ (X ـ 10) یەکی لەلای چەپی دادەنێین، بەم جۆرە: XL.

(شەست) نووسین کەبریتی یە لە (50 × 10) بەم جۆرە دەنوسرێ LX واتا (دەلای ڕاستی پەنجا).

(نەوەت) کە بریتی یە لە (100 ـ 10) بەم جۆرە دەنوسرێ XC واتا (دە لای چەپی صەتەکە) (صەت ودە) کەبریتی یە لە (100 + 10) بەم جۆرە دەنوسرێ CX واتا (دە لای ڕاستی صەتەکە). (صەت و پەنجا) ئاوا دەنوسرێ CL واتا (پەنجاکە کەوتۆتە لای ڕاستی صەتەکە).

(صەت وچل) ئاوا دەنوسرێ CXL واتا (چلەکە XL کەوتۆتە لای ڕاستی صەتەکە C) (چوارصەت) ئاوایە CD واتا (نیشانەی صەت کە C یە دەخرێتە لای چەپی نیشانەی 500 کە D یە بۆئەوەی کەمی کاتەوەو بیکاتە 400).

(شەش صەت) بە پێچەوانە، بە دانانی (C ـ 100) لەلای ڕاستی (D ـ 500)ەوە پێك دێ واتا (DC) (نۆصەت) کە بریتی یە لە (1000 ـ 100) بەم جۆرە دەنوسرێ CM (سەیری کە صەتەکە لەلایچەپی هەزارەکەیە).

(هەزاروصەت) کەبریتی یە لە (1000 + 100) بەم جۆرە دەنوسرێ MC (سەیرکە صەتەکە لەلای ڕاستی هەزارەکەیە).

دەبا ساڵی 1984 بنووسین: ـ

M CM LXXX IV

شی کردنەوەی: ـ

● یەکەم (M) ئەوە هەزارەکەیە .

● (C) یەکەو (M)ی دووەم هەردوکیان پێکەوە نۆصەتەکەن .

● (L) ەکەو هەرسێ دانە (10) کە بەلای ڕاستیەوەن دەکاتە هەشتا.

● (V) ەکەو یەکەکەی بەلای چەپەوەی دەکاتە چوار.

★★★★

تێبینی: (C) یەکەم پیتی وشەی (Centum) ە کە بەلاتینی (صەت)ی کوردییە . .

(M) یش یەکەم پیتی وشەی (Mille) ە کە بەلاتینی (هەزار)ی کوردییە .

ئومێدەوارم، خوێنەری کوردی خوشەویست بتوانێ بەم وتارە بچکۆلەیە شتێك لە لاتینی بگات و لە سەردەمی پشکەوتنی زانیاری و تەکنۆلۆژی دا ئاسۆی پەروەردەی کولتوری تۆزێ پێ بەرینتر ببێت .

بەکورتی، دەبێ بزانرێ کە «لاتینی» بابەگەورەی پێنج زمانی ئەمرۆکەیە (ئیتالیانی، ئیسپانیانی، پۆرتوگیزی، فرانسەیی و رۆمانی) وکە ئەم پێنج زمانە نەوەی پشتاوپشتی لاتینین ئەم پێنج زمانە پێیان دەگوترێ «کۆمەڵە زمانی لاتینی یان رۆمانی». دەبێ بشزانرێ کە «کۆمەڵە زمانی لاتینی» پێکەوە لەگەڵ کۆمەڵە زمانەکانی تر کە پێشتر ناومان هێنان خێزانی زمانە (ئیندۆ ـ ئەوروپاییەکان) پێك دێنن . واتا (ئیندۆ ـ ئەوروپایی) بابە گەورەی هەموویانە ـ بەلاتینیشەوە ـ بۆیەکا دوور یا نزیك، کەم وزۆر، خزماتی وپێك چوون هەیە لە نێوان هەموویان دا .

# بەسەنین



محمد عمر عثمان

ڕێبواری بووم و
هەورێ نەگریا بەسەر بالاما . .
تۆزی غەریبیی پالتۆی بەرم بوو
ڕێبواری بووم و
هەورێ نەگریا بەسەر بالاما . .
تۆف و کرێوە ڕێی سەفەرم بوو

* * *

کەوتمە دوای تیشکی دوو چاوی شۆخیٚو
دڵم هەڵوەری لە لەپی دەستیا
بووم بە گەڵایەك لەناو شەپۆل و گێژاوی هەستیا

که هاتیشمه شار ئەستێرەی بەختم
لە تەم ومژا ڕۆیی ئاوا بوو
دنیای هەستی من بوو بە کەلاوە
تا ڕۆژانێ بوو بەهەشتی خوا بوو

* * *

ئای چەند سەرم کرد بە مەیخانەدا
تا شەوەکانم بێتەوە بە ڕۆژ
هەتا سەرلەنوێ کڵپە بسێنێ
دنیای تەزیو . . و ماتی هەست و سۆز

* * *

ویستم مەست بم و لە سەر خۆشی‌یا
خەوی مناڵیم بگەڕێتەوە
ویستم بکەومە بەزم و گۆرانیی
نەم زانی تەم و هەوری زامی من . .
لە پێکی مەی‌دا نارەوێتەوە

* * *

ئەفسوس سەد ئەفسوس ئەوەی شێتی بووم
لە جیاتی ئەوەی خوڵەمێشی دڵ . . .
لە کۆشی گەرمییا گڕ بگرێتەوەو
بگەشێتەوە لەناو پەرچەم و کاکۆڵی لولا
دای بەدەم باوە . .
ئێستاش بەو زام و ئازارانەوە ئەتلێتەوە لە گەردەلولا
ئەی کچی جوانی . . لە تۆ بەولا من هیچم نی‌یە

# کەجێت هێشتم



کە جێت هێشتم ،
واتدەزانی ، ڕووبار کەناری خۆی جێ دەهێڵێ.
چۆلەکەکان گۆرانی تاریك و ڕوونی سپێدە لەیاد دەکەن ،
واتدەزانی ، جارێکی دی پرشنگی خۆر
دەستە ملانێ ی ئاسۆ نابێ
بۆ دوا جارە ، بای هەناسەم دەچێتە سی‌یەکانمەوە واتدەزانی
لەگەڵ دوا هەنگاوتا
گریان دەکەم بەپیشەو ئەسرینی تاساوم
لە چاومدا ئۆقرە ناگرن ،
دەرژێن ، بەخێرایی دەتۆرێن
کە جێت هێشتم ،
چرنوکی هەستی ساوێلکانەت
دەیویست ، ترپەی لێدانی دڵم ، بشلەژێنێ
دەیویست ، بەخێرایی بسووتێم . .
دابمرکێم . . .
نەتدەزانی ، جێ‌هێشتنت ،
نهێنی بەجێ ماوتی ، کردە مەشخەل و
ڕێگای دەیجووری ژیانی ڕووناك کردەوە و
خستمیە ناو دنیای ئارامی یەوە
لەو جیهانە بەرفراوانەدا ، گەڕام
گەلێك گەڕام
لەگەڵ هەر هەنگاوێکدا ، زیاتر ون دەبووی
وەك منداڵی هیوا و خۆزگە ، لەبار بیرم
دەچووی . .
تابەیەك جاری وون بووی
لەو دنیای ئارمی یەمدا
ئەوەی لێ‌ی نەبێ تۆبووی.

● ئەحمەد قادر سەعید ●

[ئەوەی کە تەنیا بژی
لە رۆژێکی رەشدا ئەمرێ
چونکە رۆژ بەبێ ئەو هەڵەیێ](1)

(1)

ئەم عیشقەت هێندە گەورەیە
دەڵێی نیگای ئەستێرەکان
لەبەر رووناکی عەشقتا بریسکەی دێ
هێندە ئاڵە . . .
دەڵێی خوێنی کوێستانییەکان
بە رووی شیرینتا رێچکەی دێ

(2)

بە جوانییەکەتا ئەنازی و
گشت سۆزێکی سیمای بە نیگا چنراوتی
پێ دەکەیە . .
سورمە رێژی ئەم کوێستانە

(3)

ئەوەندە دەمی ئاسۆم نایە ناخی
کەوە خەمەکانتەوە
تا وەك پەرکەم لە خوێنما
گیرسایەوە . . .

(4)

ئەوەتا وەك فریشتەکان
گوڵاو پرژێنیان کردبێ
بۆنی عەشقت لە خوێنما
گەورە ئەبێ و،



# هۆرە

محمد حسين هەڵەبجەیی

هاکا ئەم پەرکەمی عەشقەت
سەری خواردم . . . .
(٥)
بووکی بەفر . . . . لە گیانما گەورە بوویت و،
[تا تەمەنم بەرەو خەزانێکی ووشك بروا]
ڕەگی عەشقەت لە گیانی بێ تینما
گەورەترو، پەخش تر ئەبێ
(6)
عەشقەت، زریانێکە کپەو،
چاوەڕوانم هەڵم گرێ
تا بگەمە ئەو سروشتەی تێیدا ئەژیت
چونکە تەنیام . . . .
تەنیایم گشت سووچێکی ئەم جیهانەی
گرتۆتەوە . . . .
بۆ هەر لایەك
بۆ هەر جێیەك . . . . هەر وولاتێك
مەلی هیوا تیا هەڵنیشێ نامۆیە بۆم
چاوی حەزم . . . تەنها نیگای
بەفری کوێستانەکەت ئەکا
دەمی ماچم . . . . بۆ چرۆی ڕوومەتی
بووکی بەفر پێ دەکەنێ
ئەی تەنیایی . . . چەند نەسرەوتی
ئەی تەنیایی . . . چەند حەسرەتی

**(1) شیعرێکی مارکیت زیکسی کچە شاعرێکی هەنگارییە .**






جمال محمد اسماعیل

هەر وەك چۆن بەفر بەماچی
شنەی کوێستان دەتوێتەوە
ئاوا لەرەی بالاّی شۆخت
دەبێتە هەوێنی شیعرێ
وەك هەڵۆیەکێ بەرزە فر
خۆی بۆ شاترۆپکی هومێد هەڵبگرێ
یانا ببێتە لاوکێ لە چیاکان دەنگ داتەوە
لەسەر دەمی هەر تیپێکی روانگەدا
بکرێ بە سوێندی پەیمانێ
هەڵمەتی بێ‌نوێکاتەوە

●●●

ئەی شۆڕەبی لەبەر دەمتا
نوێژی پەرستن دەخوێنم
ئەگەر گراوی خۆم یاد کرد
لە جوانی بەتۆی دەنوێنم
هەر کە لارەی بسکەکانت
شنە دەیباتو دەیهێنێ
تابلۆی سێدارەو لاوێکم
لەبیرا بە دنیا دێنێ
کە خۆی کردە کۆپلە شیعرێ
لەسەر سێدارەی باوەڕدا
هەڵمەتی برد بێ نوچ دادان
تاشاری نەمری گڕدا

●●●

ئەی شۆڕەبی . . .
لەناو بەهەشتی گوڵزارا

پرچت وەك کەزی تاڤگەی خۆر
بەسەر سینەو مەمی لوتکە هەڵدەزنێ
لێوی پڕ شەکراوی نازت
بەروی روخساری ماتیما پێدەکەنێ
چاوم لێتە هەرکە ئاوازی هەناسەم
بەرەو روی تۆ دەبێتەوە

تۆم کردووە بەنۆ بوکێ
لەدڵدا پێشکەم بۆ کردووی
وەك منداڵە هێسك سوکێ
قژی سەوزت بۆتە رەشماڵی بیری ڤان
منی شەیدا چاوی جوانی تیا دەبینم
بەدیدەی زۆزانی «بێ-ـاڵ»
تاسەو پەژارەی رۆژانی
مەینەتی بێ دەتۆرێنم
ئەی شۆرەبی..
من بووم بە فەرهەنگی خەمی
هەرچی ئاشقی دنیایە
ئازاری نیگای شۆخانم
لەلا بۆتە ئارامگایە
نە ئەوەیە سەرم بیرن
وەك گۆشتی خێر بەماڵاندا
بمبەشنەوە
دەستم لەیەخەی پەژارەی
ئەم سەر دەمە بکەنەوە
تالە بەردەم هەرماڵێکدا
بێتە چڵە ئەرخەوانێ
چرۆی رەنگە بەهاری دەرکا
گراوی پێی بێنە ژوانێ

●●●

واڵە هەواری بڵندی فێنکی
بێگەردی تۆ دا خوادە بینم
بەهەناسەی گەروی خاوێن
نزای پەرستن دەنێرم



رۆژوی وەفای تۆ دەشکێنم
من چیایەکی بەفرینم
بۆ رازی دڵدارانی خۆر دەتوێمەوە
وەك نامەیەکی پێچراوە
لەناو پەلی هەر ئاشقێکی داستگۆدا
دەکرێمەوە

# بۆ کچێکی کارەکەر



● مجید ندیم ●

- 1957 -

کچۆڵەی جوان کە ئەتبینم لەناو چاوو قژی رەشدا .
سەرنج تاوتاو کە خۆی ئەسوێ بەلێوو روومەت و لەشدا .
کە بادێت و ئەجوڵێنی دراوی سەرسکی بەفرێت .
ئەڵێم ئاخۆ لەبەر ئازار بەرۆکی کام پەنا بگرێت .
بەبێ ناز ئەی خزاوی ناوکەلاوەی بێخەفی فەرتووت .
هەتاکەی روو لە بێ‌هێزی بکات باڵای لەبێ کەوتووت .
بەبێ کەس . . بۆچ نتیە دەستێ دەمی وشکت دەمێ تەرکات
ژیانی رووت و تاریکت سەراپا گوڵشەنی فەرکات .
بەچاکەیان دڵی روون بێ لەرێی ئاغا سەرت دانا .
لەماڵیشا بەبێ پەروا ئەهات وچوویی لە فرمانا .
بەڵێ دەست پاك و رووخۆشی و زمان باشیت لەناوابوو .
لەشۆخیدا لەلای خەڵكی لەشت وێنەی لەچاوا بوو .
هەتا سینی لەبەردەم دیوە خانا هەڵنەگیرایە .
مەحاڵ بوو دەستی برسێتیت بەرەوخواردن ببردایە .
لەکۆنەی بەرگی خانمدا گەلێ جار بەرخەڵات کەوتی .
ژیایت پۆشیت و هەڵسوڕایت شەبەق هەستای درەنگ خەوتی
ئەگەر خۆکردەوەی باش و کەسانی دەورو پشت ئەمرۆ .
بەرەوپیرت بەدڵ بێن و بپرسن دەردوو حاڵی تۆ .
ئەڵێم دیارە ئەبێ خۆت یارمەتی خەڵکیت لەلا نەنگ بێ .
ئەگینا بۆ دەمم ودوویان ئەبێ واوشك وبێ دەنگ بێ .
ئەبێ رۆژگار لەبەرچی بۆت نەرێژی بەرهەمی چاك بوون .
ئەوانەی خزمەتت کردن بەکام شوێن و دەرادەرچوون ؟ . .
گوڵم تۆیەك لەناو دووتوێی رزیوی پێخەف و بەرگا .
نەدڵسۆزێ بەلاتادێ‌و نە پرسێ دێتە بەردەرگا .
لەخاکێکدا ئەژی گشتی گوری چەوسانەوەی تیایە .
بەری رەنج و تەقەللامان دەسی رووتانەوەی پیایە .
لەژێر سایەی رژێمێکدا وڵات و گەل فرۆشتووبێ .
دژی پرشنگ و خویندن بێ‌و لە تاواندا نوقوم بووبێ .
ئەگەر ئەژنۆ لەبەر سنگدا بژی ومیشکیش لە تەمدابێ .
دڵی یەك بوون و هەستانمان بەلاوازی لە خەمدابێ .
ئەبێت ئیتر بەهەشت چۆن بێ . . لەژوری ئارەزوو سەربات
درەختی نیازو هیوامان لەبەرکام جوانیا بەربات . . ؟



ئەبێ کام دڵ لەشی ماندووت بنێتە باوەشی لانکەی .
لەگۆی کام مەمکی رێزگرتن ئەچێژ ی شیری پڕئۆخەی .
ئەبێ کام بیر بەجوانی لێکبنێ چاوی پشوودانت .
بەبێ گەردی بلاوێنێ کوڵ و ناڵەی حەزوگیانت .
چیە ئەو ژ ینە رووناکەی سبەینێ دێ بەرەوپیرت .
وەکو دڵسۆزو ئینسانێ بلاوێنی دڵ و بیرت .
بڵێ . . ساکام گوڵی نازدار دەروباخچەی کزت خۆشکات .
چیە ئەو دەستی ئارامەی شەرابی ئۆخەیت نۆشکات .
ئەگەر خۆ هەر بڵێ ی تاسەی تروسکەی چارەتاساوە .
تەمای هەستان لەباوەردا پەتی خەوتن گرێ‌داوە .
ئەواوتمان ژ یان وەك تۆ ئەڵێیت چۆنە ئەبێ وابێ .
یەکەم رۆژ گشت شتێ یەك یەك لەختی چارەنوسرابێ .
ئەبێ چەشنی ئەوەی دوێنێ دەمێ هات وژ یاو رۆیی .
ملی رێگەی ژیان بگرین بەبێ گۆران و بێ نوێی .
بەناکامی هەموو رووومان لەکۆشی گەرمی خەوتن کەین .
سەراپا بار گەمان بێ دەنگ لەگوێ چاوەی رەشالادەین .

بەلام ئاخۆ ئەمانەت گشت بەئاستەم خۆزگەیان تیایە .
چیە ئەوتیشکە رووناکەی لەناویاندا کە پەیدایە .
کچی جوان میللەتێ زۆری نەزان و خاکی ژێردەستە .
گومانی تیانیە تاوان ژەمی چەور دۆکەشی خەستە .
ئەزانم بیری ژەنگ گرتووت هەموو خێون لەناو هەستا .
بەرەور رووی راپەڕین ئۆردووی نەریتی کۆن گەڵی وەستا .
کەسانێکیش ئەوانەی وا ئەڵێن چۆن بووین ئەبێ وابن .
وەکو ئاژەڵ لەبەر رەحمی قەساب و پێست گورونابین .
هەتا هەین شیربدەین فەڕبین . . ئەوەی پێمان ئەکەن بیکەین

زمانمان وەرئە چەرخێ گەر بەئاستەم مافی خۆدەرخەین .
ئەمانە چاوەکەم خوێڕی‌و . . دەلاڵ و . . پیس و بێ ئابڕوون

وەکو پێلاوی پێ ی چڵکن لەبەردەرگای رەشا کەوتوون .
من وتۆ گشت لەیەك دایکین . . لە دووگیان بووین پەیدابووین

بەلام هێشتا لەژێر سایەی نەریتی بێ فەراکەوتووین .
ئەگەر هات ولەیەك گەیشتین . . بپرسین بۆ ئەبێ وابین .
لەبەرچی تاهەبین برسی و هەژارو دیل وریسوابین .
مەحاڵە وابەبێ توانا و شپرزەو دوور لەیەکتربین .
بەجارێ گشت ئەگۆڕا ئەم شتانەی بێ‌بەشیان کردین .
ئەبوو ئافرەت رژێم رێزی بەجۆرێ گەرم وگوڕبگرێ .
لەخوێندنگەو لەکارگەو بوارەکانی کاردا دابنرێ .
ژ یان پۆشتەو ولاتیش گشت سەرانسەر ئاوەدان بکرێ .
هەموو رۆژ ێ لە باخی کۆن نەمامی تازە لێ بدرێ .
ئەگەر سووچێك لەخاکماندا بەتاریکی بمابایە .
گەلێ شەرمە . . ئەبوو دەستی گەشی رووی دابگرتایە .
بەلام گیانە هەتا ئێمە بەئاغاو نووشتە باوەڕکەین .
هەوار دووروو بە ئاسانی بە ئاسۆی ژ ینی خۆش ناگەین .
هەزارانی وەکو تۆ بۆنەبوونی و رووتی دا ئەنرێ .
بزانن کەی بەلادادێ وسەری خۆی کزئەکاو ئەمرێ .

# کەف

**جەلال بەرزنجي**



خوێن و با،
دووکۆچەرن . . .
یا یادی دوو ئارەزووی گەردوونن
لە ئاسۆ وەستاوەکانیش گیرنابن
ناشبنە تاجێکی گوڵین سەری زەمین
تەڕ دەبن
لە بەرەڵلاییان زاوزێ دەکەن
پیریش دەبن، ناپووکێنەوە
خوێن ببوایە
پەتێکی ڕستراو
دەمخستە ملی گەردوون
توندم دەکرد
تا ددانە ڕزیوەکانی هەڵدەوەرین
(با)یش ببوایە
ڕووناکی‌یەکی ڕاخستراو
شانە لە کار کەوتوەکانی لەشی
خۆمم لەناویدا دەچاند
ئەوەی دەبینرا
ئەوەی دەبیسترا
خاو بوونەوەو هەڵچوونەی سەرکێشانە بوون
تازە ناگەمە ئەو کۆچەرانە . .
ئەوەی ماوە
دەیخەمە ناو ئەو کانی‌یە گەرمە
یا وەکو هەڵاوی سەری
ڕەشدەبمەوە
یاوەکو کەفی سەری سپی دەبمەوە

# مردن له ئۆردوەی
# ڕۆخ گۆماوەکە

بەرێـدەکـەوین دەگـەڵ هەوری تۆراوو کۆچکردوو . . بەرەو باشـوروو باکـوری . . . خۆ دەدەینـه بەر تیشکی پنجـه گیایه سرە لێدراوەکان . . تێر دەبین له مژینی شته ئاویەکان . . .

واژی = ئاودیو.

●- اسماعیل انور شفیق .-●



گیانی داوەته دەست گەواڵەیێ
کەپێش خۆرەتاوێ هەڵدەکا
کاتی خۆی بەیەکەوە
لەم کەلاوەیەدا چێشتەخەومان دەکرد
من و . . . ئەوی هەڵقرچاو
ڕووەو سارداوێ غارمان دەدا
پەنجەرەکە داخە
بالەودیو نایلۆنەکەوە بت بینم
ڕوانینەو بەس
چێشتەنگاوی بۆنی هاوینمان کرد
زستان بووە وەرزی نەمریو خزین
وابە تۆوە دەمگرێ
بەختیار بە
دەچیتە نێو گیانی شیعرێ
ئەوە گڵۆپ

ڕەنگی کاممان زەردترە
جێو بالینگانم جێ هێشت
واژی نابیت
سێبوریم پێدێ
ئەو دەستەسرەی قەدی نەشکاوە
ئەو قۆمەتە بەردەی والەپێش ماڵێ (گوندێ)یە
پەنجەرەکە ئاوەڵاکە
لافاوە

# کی دێ ڤێ کێلێ شکێنت



ـ کەکودێ هلۆرابە، تڤەنگا خو پاڤێژە ملێ خو، ما تە نەڤێت لگەل مە بهێ زافایی ببنە سەرشویێ.
دەمی عەلی ئەڤ ئاخڤتنە گۆتینە مێهڤانێ خو، مێهڤانی بەرسڤا وی دا:

ـ برا شولا من چو سەرشو نینن، ئەز دێ بارێ رەش میوێ خو فروشم و بۆ بچویکێت خو دەمە ب شەش حەفت وەزنێت گەنمی بو من چێترە.

ـ کەکو خو بلەزنە ئێخە، ئەڤرۆل گوندی دەواتە.. رەش مێو بخو دێ چت.. هلو لگەل مە دا زاڤایی ببنە سەرشویێ، ئەز بێژ مە تە رەش میۆ دێ چت.

پشتی ڤان ئاخفتنا عەلی و مێهڤانێ خو لگەل ئێشیکا دەواتییا بەرێ خو دا قاما ژ ووری ژ گوندی دا سەرێ زاڤایی بشون.
ـ هەکو هەمی پێکڤە گەهشتینە جهێ سەرشوکێ، دەنگی دەهول و زورنایێ ب سەر گوندیڤە دچو... ب کەنیی و بشکورین، تولازا ملێت زاڤایی گرت بون و بۆ سەرشویێ دبر... عەلی لگەل هندەك دەواتییت دی خو هاڤێتنە پشت بەرا، دا کێل و ئارامانجێت خو بشکێنن.

میهڤانێ عەلی تڤەنگا خو لبەر خو گرت، و سەر بەرەکی روینشتە خارێ. . هاتە بیرا وی، کا چەوا بەری پازدە سالا، دەواتا وی لگوندێ وان هات بو کرت. . وێ رۆژێ کێم کەس هات بونە دەواتا وی، چونکی ب بابێ وی چێ نەدبو دەهول و زورنا بینت.

مەیهڤانی عەلی بەرێ خو دا ڤان گوندییا. . . رەختێت خو کرنە قاویش، کو ئەو کێلا لبن بەرێ مەزن هاتیە ڤەدان بشکێنن، بەلێ ب کەسێ چێ نەبو دەنگەک هاتە گوهێت میهڤانی : -

- گەلی برا دێ نهو کێلەکا دی ڤەدەن، ما هنگ نزانن. . ئەڤەیی دەواتا سەرداری کورێ قادری ئەڤ کێلە لبن بەرێ مەزن هاتییە ڤەدان و کەسێ نە شکاندییە).

دەنگەکی دی بەرسڤا وی دا :

- ئەم چو کێلێت دی نا ڤەدەن. . وا هە کێلا ڤەدایە. . سەگڤان ئەو سەگڤانە یێ کێلا لبن بەرێ مەزن را بشکێنت).

عەلی دەستێت خو دانانە سەر رەختێ خو، پشتی تڤەنگا خو هەلپسارتیە بەرەکی. . ئو لگەل خو گوت: (ب راستی یا باش ئەوە میهڤانێ من ژی هندەك تڤەنگا پاڤێتە کێلێ بەلکی ئەو بشکێنت؟ ئەز دزانم ئەو گەلەکێ سەگڤانە. . هەکو زستانا چویی ئەز ل گوندێ وان. . . بەحس، بەحسێ وی بو. . خەلکێ گوندێ وان دگوت: ئێك هەیە ب تڤەنگەکێ دوو نێرییێت کیوی بکوژت؟ ئەرێ دێ بێژمێ بلا ئەو ژی خو بچەربینت. . . نە، ئەز نا بێژمێ. . هەکە ئەوی، ئەو کێل شکاند. . بو مە کێماسییە. . چەوا کەسێ لگوندێ مە ئەو کێل نەشکاند. . و ئێکی لگوندەکێ دی. . ئەو کێل شکاند؟ ئەوژی وەیە، بەلێ هەکە ئە چو تڤەنگا نە هاڤێت، دێ زڤرتە گوندی خو دێ بێژت: لدەواتێ خەلکێ فلان گوندی نەشیان کێلەکێ بشکێنن. . ئەز وێ ئاخڤتنێ بو نا هێلم. . هەکە شکاند دەستێت وی خوش. . هەمی دێ بێژن میهڤانێ عەلی کێلا بن بەرێ مەزن شکاند. . هەکە نە شکاند، دا نەبێژت لڤی گوندی چو سەگڤان نینن).

دەمێ عەلی دڤان هزرا وەربی. . میهڤان دناف چاڤێت وی فەکری. . هاتە بیری کو ئەو میهڤانێ عەلییە، و عەلی رەختێ خویێ کریە قایش. . یا لسەر وی ئەوە. . سەرێ خو و عەلی بلندکەت و وێ کێلێ بشکێنت.

میهڤانی دەستێ خو هاڤێتە تڤەنگا خو و رابوڤە گەلەك کەیفا عەلی هات. . ئینا گوت : -

- دێ میهڤانێ مە. . سەرێ مە بلندکە. . وێ کێلێ بشکێنە.

- برا. . نزا ئەز دێ چ بێژم. ؟

- برا چو نە بێژە. . ئەز دزانم تو سەگڤانەکی ب هنێری. . ڤێجا وی کێلێ بشکێ نەو چو نە بێژە.

- برا عەلی. . لڤێ دەواتێ ب من چێ نابت چو کێلا بشکێنم. . . نێ دەرزیکا تڤەنگا من یا شکەستییە.

● محمد سليم سوارێ ●

# بەستەی پەترێل





له قولاّیی ئاسمـانـدا، لەسـەرووی دەریا زیوینی‌یەکەوە، گەردەلـوول پەڵـەهەوری ڕەش و تێك خزاندبوو، لەنێوان پەڵە هەورەکـان و دەریـاکـەدا، پەتـریـڵ بەنـازەوە بەئـاسمـانـدا دەسـوڕایـەوەو وەك تیسکی سمـۆرە دەبـریسکـایـەوە. پەتریل جارێـك نزم دەبـووەوەو لەشـەپۆلی ئاوەکە دەخشا، جارێکی‌تر هەڵـدەستـایەوەو وەك تیر بەناو پەڵە هەورەکاندا تێ‌دەپەڕی، بە دەنگێکی بەرز دەی‌چـریکـاندو پەڵەهەورەکانی بە چریکەکەی شاگەشکە دەکرد.

پەتـریـڵ لە چریکـەکـەیـدا ئارەزووێکی گەرم و بەتینی بۆ گەردەلوول وەدەردەخست، لەچریکەکەیدا سووربوونی خۆی لەسـەر ئارەزووو ئامـانجـەکـانی ئاشکـرا دەکرد، بەچریکەی سەرکـەوتن دەی‌چـریکـانـدو سووریش بوو لە دڵنیـایی و وەدەست هێنانی سـەرکەوتن.

نەوڕەسـەکان بە دەنگێکی غەمگینەوە ئاخیان هەڵدەکێشا، نزیـك لەسـەر ڕووی ئاوەکە زۆر بەنەرمی دەخشان و بەدڵێکی خۆشـەوە ئازارەکـانیـان لەنـاو دەروونی دەریـا شینـە بەکەف و کوڵـەکـەدا دەناشت. ماسیگرەکانیش هەر هەمان شێوە ئاخیان هەڵـدەکێشا ئەمان شاگەشکەی خەبات کردن نەبووبوون و لە هاژەهاژی دەریاکەو پرژانی ئاوی شەپۆلەکان دەترسان و لێی دووردەکەوتنەوە.

پەنـگـوینـە ساویلکـەکـانیش لەنێـوان بەردەکـانـدا

**مەکسیم گۆرکی**

**نەوزاد عبداللە ئاغاباوە لە ئینگلیزی‌یەوە کردوویە بە کوردی**

هەڵ نیشت بوون، هەر پەتریلْ بەتەنیایی لەئاسماندا بەسەر دەریا زیوینی‌یە بەکەف وکوڵەکەدا، بە نازەوە دەهات و دەچوو.

هەتا دیارەو چاو بردەکا هەر پەڵەهەوری رەشەو بەسەر دەریاکەوەیە، شەپۆلە پر نەغمەکانیش تینووی هەڵگەرانەوەن بەسەریەکتریدا، بەسەر یەکتریدا هەڵدەگەرێنەوەو بەرەو قەراغەکە دێن، شریخەیەکی بڵند لە گابەردەکانی قەراغ ئاوەکە هەڵدەستێنن.

هاژە هات. دەریاکەو گەردەلوولەکە لە شەرێکی توندو تیژدان، گەردەلوول شەپۆلەکانی دەریاکە بە بەردەوامی لەباوەش دەگرێت، شەپۆلەکان لمێکی زمورددی لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرن و بەسەر لاپاڵە بەردینەکانی قەراغ دەریاکەدا پەرش وبلاوی دەکەنەوە.

پەتریلی قەشەنگ وەك تیسکی سمۆرە لەئاسماندا دەبریسکایەوەو دەی‌چریکاند، بەناو هەوروتەم و مژەکەدا وەك تیر تیٚ‌دەپەری‌و ئاوەکەشی زۆر بەئاسانی‌و بەنەرمی دەبری.

پەتریلْ وەك دیمۆنی تۆقێنەر لەئاسماندا هەر لەهات وچۆردابوو، هەروەك دیمۆنی رەشی درندە دەتریقایەوە، هەنسکی‌دەدا، بە هەوروتەم ومژ پی‌دەکەنی‌و لەگەڵ گەشکەشیدا هەنسکی دەدا.

پەتریلی زۆرزان ماندوویٚتی‌و پەك کەوتنی لە گرمەو هاژەو هاواری شەپۆلەکاندا هەست پی‌دەکرد، دەی‌زانی کە گەردەلوول دادەمرکێتەوەو رۆژ سەردەکەوێت هەموو دەم هەر رۆژ سەردەکەوێت.

دەریا هاژەی هات، برووسکە لی‌ی‌داو هەور گرماندی، هەندێ برووسکەی مۆری شین باو لەناو هەورو تەم ومژەکەدا، لەسەر دەریا بەکەف وکوڵە زیوینی‌یەکەدا داگیرسان، تروسکایی‌یەکەیان لەناو باوەشی دەریاکەدا بەند دەبوون و دادەمرکانەوە، شەوقدانەوەی برووسکەکان لە ئاوەکەدا بە شکاوەیی‌و خوارو خێچی بە ئاستەم پی‌دەبوون و دواهەناسەیان هەڵدەکێشا.

گەردەلوولە . . . . گەردەلوول هەڵی کردووە!

تا ئیستاش پەتریلی قەشەنگی چاونەترس هەر بەنازەوە لەناو برووسکەکاندا، بەسەر هاوارو هاژەی دەریا بەکەف وکوڵە دڵ پرلەقینەکەدا هەرهات وچۆی دەکرد. دەنگ دانەری چریکەکانی نیشانەی ئەوپەڕی دڵ خۆش بوونن وە وەکو مژدەی سەرکەوتنن.

لەدەریا گەرێن با لەناخی دڵی‌یەوە هەڵبچێت و بتەقێتەوە!

(1) پەتریلْ: باڵندەیەکی بچووکی ئاوی‌یە، باڵەکانی درێژن، رەنگەکەی مۆرە، بەسەر ئاودا دەگەرێ‌و لە ئاسماندا لەنگەر دەگرێ، بۆ راوکردنی نێچیرەکانی ناو ئاوی.



# لەو دیو شتە جوانەکانەوە

چیرۆکی : خاتو «ألفة الادلبي»

وەرگێڕانی : ڕەوف حەسەن

خانمە خانەدانەکە بە میوانەکەی ـ کە ئەدیبێکی ناسراوە ـ ووت : زۆر بەداخەوە درەنگ کەوتم ، ناچار بووم لە ماڵ دەرچم بۆ سەردانی نەخۆشێکی زۆر ئازیزم . . واشم دانابوو بەرلەوەی جەنابتان تەشریف بێنن بگەڕێمەوە ، بەڵام بۆم نەلوا . . هیوادارم لە چاوەڕوانی مندا وەڕس و بێزار نەبووبیت .

ئەمەی ووت و پاڵتۆ فەروەکەی داکەندو لەتەك جانتاکەیدا لەتەنیشت خۆیەوە لەسەر قەنەفەکە دانان .

میوانەکە لە وەڵامدا ووتی : ـ

ـ نا . . خانم . . بێگومان بە من لەم هۆڵە رازاوەیەدا هەستم بە هیچ بێزاریو وەڕس بوونێك نەکرد . . لەم هۆڵەدا . . لەسەر قەنەفەیێکی نەرم و شل پاڵ دەدەمەوەو کاتێ سەیری ئەو کەل ویەل و تابلۆ دەگمەن و بێ هاو تایانەی دەورم دەکەم ، کە بە زەوقی بەرزت هەڵت بژاردوون . . هەست بە گەرم و گوڕی یەکی خۆش دەکەم . . هەریەکێکە لەو شتانەم لە جێی شایستەی خۆی دانا . . لە کاتێکدا تێم دەڕوانین . . دڵم ختوورەی کرد لەتەك شتەکاندا بدوێم و بیان هێنمە زمان . . ئیتر هەریێکەیان چیرۆکی سەیرو سەمەرەی خۆی بۆ گێڕامەوە . .

ـ ئای . . چەند ئەو قسە خۆش و شیرینەتم پێویستە تا کەمێ پەژارەمی پێ بەبا بدەم . . چونکە ئەم ئێوارەیە نەگبەتیمەو هەتا بڵێی خەمناکم .

ـ ئەم هەمووە خەمناکی یە لەپای چی ؟ نەگبەتی چی ؟ لە خوا بەزیاد بێ ، خوا هەموو خێرو بێرو بەختیاری یەکی بەسەردا داویت .

فرمێسك بەری چاوی خانمی گرت و ووتی : ـ

ـ ئاخ . . سەگەکەم . . بۆبی نازدارم . . پیرو پەککەوتەیەو دووچاری دەردێکی گران بووە . . پزیشکەکەی وای بەباش زانی لای خۆی گلی بداتەوەو لەژێر چاودێری خۆیدا بێت . . پێش تۆزێ چوومە سەردانی تا لێی دڵنیابم . . پزیشکەکە پێی ووتم : چارەسەرکردنی بێ سوودە . جا ئەگەر بەراستی خۆشم دەوێ و بەزەییم پێیدا دێتەوە . . ئەوە دەبێ بە کوشتنی قایل بم تا لە ئێش و ئازار رزگاری بێت . . پزیشکەکە گفتی دامێ بیمرێنێ . . بەڵام مراندنێکی خێراو سووك . . بێ ئێش و ئازار . . منیش داوام لێ کرد کەمێ مۆڵەتم بدات بیری لێ بکەمەوە . . تەسەوورکە . . چەند جەرگبڕە بە کوشتنی (بۆبی) قایل بم . . (بۆبی) ئاوەڵی بەوەفای چەندان ساڵەم !



وەڵامی نەدایەوە . . بە زەردەخەنەیێکی پڕ لە تەشەرەوە پیایدا هەڵدەروانی . . خانم ووتی :

ـ ئەوە بۆ وا بێدەنگ سەیرم دەکەیت؟

ـ ماوەیێکی کەم لەمەوبەر، کە خۆت کرد بە ژووردا شەنگ و شۆخی یەکەت وری کردم . . بە پاڵتۆ گرانبەهـا لە پێستی پڵینگ دروستکراوەکەتەوەو بە جانتای شۆڕ بووەوەی سەر شانت کە لە پێستی نەهەنگ دروستکراوەو بە دوگمەیێکی لە کەڵبەی فیل دروستکراو رازاوەتەوە . . بەڕاستی فەشەنگ و نازدار بوویت . .

ـ چەند دڵرەقیت! من باسی کلۆڵی خۆمت بۆ دەکەم لەگەڵ بۆیی بەسەزمان دا . . کەچی تۆ باسی رێکپۆشی من دەکەیت!

ئەدیبەکە بەبێ ئەوەی گوێی بداتی ووتی : ـ

ـ بێگومان پاڵتۆکەت لە پێستی چوار پێنج پڵینگی تازەپێگەیشتوو دروستکراوە . . بریقەداری‌و نەرم و نۆڵی مووەکەی بەڵگەی کەم تەمەنی پڵینگەکانە . . خانمۆڵەکەم! وەك دەزانیت پڵینگ دەسەڵاتداری نێو دارستانە . . سەرچڵ و بزێوو بەدەمارە . . هەرکە بە دەنگە گرەکەیەوە بەنێو دارستاندا تێپەری . . گشت ئاژەڵان لەبەریدا هەڵدێن و خۆیان دەشارنەوە . . لە پەناوە بەوپەڕی سەرسامی‌و ترس و لەرزەوە پێیدا هەڵدەروانن . . ئەگەر هاتوو بەدبەختێکیان بووە نێچری . . ئەوا پڵینگەکە تەنیا ئەندازەی خۆی لێ دەخوات، ئەوی دیکەی بۆ سەگەڵ و درندە جێ‌دێڵێ . . بۆ ئەوو هەڵۆیانەش کە لە بەرزاییەوە شوێنی دەکەون . . تا لەدواییدا هەڵکوتنە سەر پاشماوەی خواردنەکەی . . پڵینگ هەردەم وەك پیاوانی دەست و دڵفراوان و لووت بەرزە .

جارێکیان چوار پێنج پڵینگ لە جێ‌یەکی چۆڵەوانی یەکانی ئەفەریقا . . یا ئەمەریکا، یا لە بێشەلانێك دا لەو بێشەلانە چڕوپڕو پان و بەرینانەی هیندستان دا . . بە لەخۆبایی بوون و شانازی کردن بە گەنجێتی‌و جوانیانەوە دەگەڕان . . کاتێ لەگەڵ گزینگی بەیاندا . . چەند پیاوێکی ئازاو بە توانا . . کە سەری دنیایان لێ‌هاتۆتەوە یێك و، بە ناچاری دەستیان داوەتە راوە پڵینگ . . ئەو کارەگران و پڕ مەترسی یە . . تا پاروو نانی خۆیان و منداڵەکانیان بە چنگ بخەن . . ئەویش کاتێ کە گیانی لەخۆبایی بوونی ئێوەمانای خۆشگوزەران دادەمرکێننەوە ئێوەمانانێك کە لەپێناوی رێکپۆشی‌و شۆخی‌دا پیسکەیی نانوێنن .

ـ چیرۆکێکی چەند خۆش و سەیرە . . خەیاڵی پڕ جۆشت چاکی دەهۆنێتەوە .

ـ پەلەمەکە . . جارێ چیت لێ بیستووە؟ . . چاپووکترین راوچی‌یان لاوێکی ئەسمەر، باڵا بەرز، چاوتیژ، تۆکمەو تێکسمراو . . بازوو پتەو . . لەو رۆژ وە دەستی داوەتە راوە پڵینگ، جارێ نەبووە نێچر نەپێکێ . . بەڵام ئەمجارەیان . . هەر لوولەی تفەنگەکەی کردە ئەو پڵینگە درندەیەی لە نیوەڕۆدا پێستەکەیان بۆ ئەم پاڵتۆیەت گوروو «ئیشارەتی پاڵتۆی گرمۆڵە بووی

سەر قەنەفەکە دەکات ـ . . بەختی نەیهێناو نیشانەی نەپێکاو گولەکەی کاریگەرو کوشندە نەبوو . . ئیتر پڵینگە بریندارەکە لەناکاو هەڵمەت دێنێتە سەر سنگی راوچی‌یە لاوەکە . . لە چاوتروکاندنێکدا گەڵبە تیژەکانی لە قورقوراگەی گیردەکات و چنگە تیژە بەهێزەکانیشی لە لەشی بەرلەوەی هاورێ راوچی‌یەکانی پڵینگەکە بەر لێشاوی گوملە بدەن و بیکوژن ، ئەو لاوەکە پارچەپارچە دەکات . .

بروانە . . (پاڵتۆکە هەڵدەگرێ‌و لەبەردەمی خانم دا دەیکاتەوە) جێ گوللەکان لێرەداو . . لەوێدا هێشتا دیارن . . ئەها لێرەدا گری‌دان و دروونەوەی شارەزایانەش بەتەواوی کونەکانی نەشاردوتەوە .

خانم وای بە خەیاڵدا هات ئەوکونە چنراوانەی بە دەست ئیشارەتی بۆکرا بەتەواوی دەیبینێ‌و لە راستیشدا زۆر دەگمەنە پاڵتۆ کونی ئاوەهای تیا نەبێ . . پەردەی خەمناکی لە رووی خانم دەنیشێ‌و ئەدیبەکە بەردەوام دەبێ :

ـ ئایا ئەم راوچی‌یە بەسەزمانە ، کە بەو شێوە ناهەموارە مرد . . ئایا . . کە ئەجەلی هات ـ ئاواتەخواز نەبوو مردنێ بمرێ بێ ئێش و بێ ئازار؟ وەك ئەو مردنەی پزیشکە شارەزاکە بۆ (بۆبی) گەماڵە پیرە ناز پێ‌دراوەکەتی شایستە دیوە!

ـ چی‌وای لێ کردوویت بەهۆی پاڵتۆ گرانبەهاکەمەوە ، ئاوا هێرش بێنێتە سەرم؟! ئیتر لەمەودوا هەر لەبەرم کرد وام بە خەیاڵدا دێت لاوەکە لەژێر چنگ و گەڵبەو چەپۆکی پڵینگەکەدا پارچە پارچە دەبێت .

ـ جارێ چیرۆکی پاڵتۆکەت تەواو نەبووە . . ئەو چوار پێنج پێستەی پڵینگەکان بەشی ناکات و بەرگدرووە شارەزاکە کەوڵی دە سمۆرەی (١) نەرم و نۆڵی دیکە دێنێ . . ئەوانەی لە گەنجێتی‌یاندا بە جوانی‌و شۆخی‌یەکەیان سەگەکەی تۆ (بۆبی) بۆر دەدەن . . بەتایبەتی کاتێ لەنێو دارستانەکاندا گەمە دەکەن و بەسەر درەختدا هەڵدەگەرێن ، تا ئەشقبازی لەتەك تریفەی مانگدا بکەن . . بەرگدرووەکە لە کەوڵەکاندا رەنگی قاوەیی تۆخی هەڵبژاردووە تا لەتەك رەنگی پێستە پڵینگەکاندا بگوبجێت و بیکاتە مخەو ملیوانی پاڵتۆکەو قەراغ و سەر دەستەکانیشی پێ برازێنێتەوە . بروانە . . خانمە نازدارو شۆخەکەم . . بروانە چ تاوانێکی خوێناوی بەسەر شانە خروخەپانەکانتدا دەدەیت ، کاتێ پاڵتۆ بەنرخەکەت لەبەر دەکەیت!

ـ ئەوەی سەبووریم دەداتەوە ئەوەیە . . هەموو ئەوانەی دەیڵێیت خەیاڵی نێوخەیاڵن . . ئەگینا بۆ دەبێ هەر پاڵتۆکەی من بووبێتە هۆی کوشتنی لاوەکە؟!

ـ هەرچی شتێ هەبێ رووبدات دەتوانین وای دابنێین بە راستی روویداوە . . بێگومان بە ئەوەی بۆم باسی کردیت لەنێو جەرگەی واقیعەوەیە . . ئەگەر بۆ پاڵتۆکەی داوە . . لەو هەزاران پاڵتۆیەی شۆخانی تۆ ئاسایی لەبەری دەکەن . .

ئەمجا ئاور لە جانتاکە دەداتەوە بە سەرسامی‌یەوە تێ‌ی دەروانێ‌و بڕۆی سەرسورمان هەڵدەتەکێنێ . . خانم دەڵێت .

ـ ئەی ئەمەیان چۆن؟ ئایا داستانێکی کوێرەوەری ئامێزی دیکەش لەم دەهۆنیتەوەو بە بەڵگە سەلمێنەرەکانت قایلم دەکەیت کە نەهەنگەکە راوچی‌یەکەی ئەمیشی کردوتە نێچیر؟!

ـ ئەمە لە واقیعەوە بەدوور نی‌یە . . بەڵام ئەمجارەیان لەو کوێرەوەری‌یە خوێناوی‌یەت دوور دەخەمەوە . . چونکە وا دیارە دڵت زۆر ناسکە . . تەنیا باسی ژیانی رەنجدەرێکت بۆ دەکەم راوە نەهەنگی کردبێتە پیشە . . ئەگەر ئێستاکە لەبەردەمتدا بوایە ، بە بینینی مووچرکەت پیا دەهات . . پێ‌ی پەتی . . قژی بژ . . لەشی رووت . جگە لە پارچە پەڕۆیەکی کۆن و دڕاو بە ناوقەدی‌یەوە بەستراوەو تا سەر ئەژنۆی شۆڕبۆتەوە . . بەهۆی برسێتی درێژخایەنەوە ئێسکەکانی دەرپەریون . . رمێکی درێژی بە دەستەوەیە . . وەك تارمایی بەدەوری رۆخی رووبارێکدا دێت و دەچێ . . رەنگە ئەو رووبارە نیل بێ یا کۆنگۆ یا ئامازۆن . . یا هەر رووبارێکی دیکە بێ لەوانەی نەهەنگی تیا دەژی . .

هەرکە قاچەکانی لە ماندوێتیدا پەکیان کەوت و برسێتی برسی لێ بری‌و بە راوی نێچیرێك شاد نەبوو . . لەسەر کەناری رووبارەکە دەستەو ئەژنۆ دادەنیشێ . . لەم کاتەدا چەشنی پەیکەرێك دەنوێنێ رەمزی برسێتی‌و بێ‌بەشی بێ . . چاوە جیوە

ئاساییەکانیشی بەردەوام و تا بڕبکات هەر لای ڕوبارەکەیە.

سات لەدوای سات و ئارامگرتنێکی سەخت ناهەموار.. هەر تاریکیش داهات، ڕمە درێژەکەی هەڵدە گرێت و بەرەو کوڵێتە دوورەکەی قاچەکانی بەدوای خۆیدا کێش دەکات و هەنگاوی نەهامەتی دەنێ.. جگە لە بێهیوایی یەکی تاڵ هیچی دیکەی بۆ ژن و منداڵەکانی پێ نی یە.. ڕەنگە ڕۆژان ورۆژانی دیکەش بەم جۆرە بێت.. چونکە نەهەنگ زۆر دەگمەنە.. دوای ئەوەی ڕواچی یەکانی زۆر بوون و داواکاری لەسەر پێستە گرانبەهاکەی زۆر بوو، هەندێ ولات ڕاوکردنیانی قەدەغە کرد، نەك بە ئێخگاری قریان تێ کەوێت.. ئیتر ڕەنگە بەختەوەری بەدەم ڕواچی یە کلۆڵەکەمانەوە بەئاستەم زەردەخەنە بیگرێت و پاش ئەو ماوەیە، شەپۆلەکان نەهەنگێکی گچکەی نەگریس کە لەو نزیکانە مەلەی کردووە، بۆی بێنێ و بە گورجی ڕاوچی یە چاپوکەکە ڕاست بێتەوەو زۆر شارەزایانە ڕمەکەی تێ سرەوێنێ و بیکوژێت.. ئەمجا هەڵی بگرێت و بەرەو بازار.. بە بازرگانێکی دەستبڕو چاو برسی بفرۆشێت.. دوای بگرەو بەردەیێکی زۆرو ئەو هەموە هەوڵ و ماندوێتی یە، نرخێکی زۆر هەرزانی لەسەر دانێ..

بەڵام نەخشەکێشی جانتاکەت وای گەرەکە زۆر نایاب و پوخت دەرچێت.. بۆیێ دوگمەیێکی لە دانە فیلی بریسکەدار بۆ هەڵدەبژێرێ..

پیرە فیلە لە سەرەتای لاوێتیدا لە فێل و تەڵەکەو تۆری هەمە جۆری ڕاوچی یان دەرباز ببوو.. کە بە ساڵا چوو، هەستی بەوە کرد مەرگ دەورو خولی دەدات.. بەهەنگاوی قورس و گران ملی بەرەو ئەو بێشەلانە دوورە نا کە فیلەکان کردوویانەتە گۆڕی خۆیان و هەرکاتێ پەکیان کەوت، بە دڵنیاییەوە ڕووی تێ دەکەن و خۆیان بە چارەنووسیان دەسپێرن.. تاوانی ئەم فیلەش ئەوەیە.. دوو کەڵبەی درێژی هەیەو ڕاوچی یەکانی وا لێ کردووە لە ڕێگەکەیدا چاڵێکی تەنگەبەر هەڵکەنن و سەری بە گەلاو پووش بگرن.. هێندە ناخایێنێ فیلە بەسەزمانەکەی تێ دەکەوێت.. ئیتر پیاوان لێی ڕاست دەبنەوەو بە پاچ و ڕم تێی بەردەبن، ئەویش لەو تەنگەبەری یەدا جووڵەی بۆ ناکرێت.. تا ناهەموارترین مردن بە چاوی خۆی دەبینێ.. ئەگەر بلوایەو چارەنووسی سەگەکەت (بۆبی) بزانیایە.. زۆر بەغیلی بەو مەرگە شیرینەی دەبرد کە پزیشکە زۆرزانەکەت پێی ڕەوا بینیوە.

خەمناکی تێزایە سەر ڕووی جوانی خانمەکەو ووتی:

ـ بەنیسبەت بۆبی بەسەزمانەوە زۆر دڵت دامەوە.. بەلام زۆرت بە خۆم کرد بەهۆی شتە جوانەکانمەوە.. بە ڕاستی کوێرەوەری یەکانی ئەم ژیانە جەرگبڕن.

ـ ڕەنگە لە هەموویان جەرگبڕتر ئەوانە بێت کە بەرگی جوانیان تێ گیراوە.. بڕوانە ئەم ئۆرتە گەورەو قەشەنگە.. ئایا ئەوەی سەیری دەکات وا نازانێ گوڵزارێکەو لە ڕۆژانی بەهاری شاری شیرازدا گوڵەکانی پشکووتوون! بە زاتی خوا وا لە خەڵکی دەکات بنوشتێنەوەو گوڵە جوانەکانی بکەنەوە.. باشە چەند ساڵ ئەم ئۆرتەیە لەسەر تەونەکەی ماوەتەوەو ئاخ و ئۆفی بێزاری بەرگوێ کەوتووەو ناڵەو نکەی نەخۆشی بیستووەو بە چاوی خۆی هیواو ئومێدی ڕووخاوی دیوە؟!

لەوانەیە منداڵی بچووك چنیبێتی.. یان کیژۆڵە تازە پێگەیشتوەکان.. هەرکە پەنجە تەڕو برەکانیان توانای چنینی خوریان تێ گەرا.. کەسوکاریان بەزۆر خستوونیانەتە خزمەتی تەون.. ئەمەش هەر بۆ پارووە نانێك.. نە منداڵێتی بەختیاریان زانیوە چی یەو نە ڕازی کچێنی.. لەوانەشە بە دەگمەن تێیاندابێ لە نەخوشی سامناك ڕزگاری بووبێت.. کە بەهۆی وردە پەتکەوە لە سینە خاوێن و تەڕو تازەکانیاندا جێگیر دەبێت.

ئەمجا دەڕوانێتە کاسەیێکی چینی لە گۆشەیێکی هۆڵەکەدا.. ـ ئەم توحفە چینی یە کە نرخی تەواو نابێت. بڕوانە هونەرمەندە چینی یەکە چۆن بە تەنێ دوو هێڵی گچکە زەردەخەنەیێکی ماناداری قووڵی پڕ قەشمەری لەسەر ڕووی پیرێك دروست کردووە.. لەوانەیە ئەو پیرە لە دانایانی کۆنی چین بێ.. ئەوانەی بەختیاریان لە کەمترین بەش و ساماندا دەدی یەوەو گاڵتەیان بە پلاری گەردوون دەکرد لەم

جیهـانـه بێ فـەرو نەگریسەدا . . باشه تۆبڵێی دروستکـەری ئەم توحفـەیـه توانیبێتی لەم هونـەره نەمـرەیدا جگە لە نرخی چەنـد مشتێ برنـج زیـاتـری دەستکـەوتبێت کە بە هەزار حاڵ بەشی سکی خۆی و خێزانەکەی بکات؟!

ئایـا هەواڵی ئەو تابلۆکێشه کلۆڵەت پێ نەگـەیشتـووه کە پوختـەی گیـانی هونـەری خۆی لەو تابلۆ بێ هـاوتـایەدا داناو دوایی دای بە پێکێ مەی تا هەموو خەمـەکـانی تێیـدا بخنکێنێ و . . دوای ماوەیێکی کەم تابلۆ دەگمـەنـەکـەی بە هەزاران جونەیهـ فرۆشرا . ؟

خانـم هۆشـی لای خۆی نەمـاو ئەمیش ووریای دەکاتەوە :

ـ ئەوە بۆ وات بەسـەر هاتـووە؟! دەڵێی ئاگـات لە من نەمـاوە . . بیر لە چی دەکەیتەوە؟

ـ نا . . لەگـەڵـتـام بۆیـێ بیـردەکـەمەوە . . باشە دەزانی ئێستا بیر لە چی دەکەمەوە؟

ـ جا لە من زیـاتـر کێ هەیـە بزانێ لەنێـو ئەو سەرە جوانکیلەیـەی تۆدا چی هەیـە! خانمەکەم . . تۆوا بیردەکەیتەوە کە بەتـەنـێ بە ڕێیـەکـی چۆڵ و سامنـاکـدا گەشت دەکەیت . . لەناکاو هەست دەکـەیت ڕاوت دەنێن . . ئاوڕ دەدەیتـەوە . . ئای چی دەبینی . . پێنج پڵینگی تازه پێگەیشتوو، پیرە فیلێك . . نەهـەنـگێکی گچکـە . . هەروەهـا ڕاوچییـەکی لاو لوولـەی تفـەنگی تێ کـردوویـت . . پیـاوێکی قژ بژی ڕووت ڕمـەکەی ئاراسته کردوویت . . لەم کاتـەدا دیمـەنێکی زۆر خەمنـاك و زۆریش پێکەنیناویت دەبێت .

ـ تکایه تۆزێ لەسەرخۆبه . . من نە حەزم بەوەیـە کەس خەمم بۆ بخوات و نە پێشم پێ بکـەنێ . . ئەم هەموو بگره بەردەیە چی‌یە؟! خۆ من بکوژ نیم . .

ـ بەڵام تۆ هانـدەری کوشتنیت . . هانـدەری کوشتن لە هەمـوو پێـرەوو یاساییکدا تەواو وەك بکوژ وایه .

ـ باشـە ئەی ئەوانـەی وا تەسـەوور دەکـەیت ڕاوم دەنێن ئایـا هەمـوویـان بکـوژ نین؟ بۆ نمـوونه : ئایا ئەو پڵینگه بکوژ نی‌یە؟

ـ خانمـەکـەم خوا لێت نەگـرێت و بەلای خراپـتـر بە دوورت خات . . پڵینـگ بۆئـەوە دەکـوژێ ژیـانـی بپـارێـزێ . . بۆ ئەوەی بخـوات و بەرگـری لە خۆی بکـات . . هەرکـە تێـری خوارد واز لە کوشتـن دێنێ . . بەلام ئێـمـەی بەشـەر، بەلای ئەم گەردوونـەین . . دەکـوژین بۆئـەوەی خۆمـانی پێوەهەڵکێشین . . دەکوژین و دەبـڕین تا شانـازیو ئینتەلا بکەین . . دەکـوژین تا هەنـدێکمان لەوانی دیکه زیـاتر ڕابوێرن و کەشخه بکەن . . ئەم چاوبـرسێتی‌یـەشمـان بێ سنـووره . ئەگـەر بەدوای هەر تاوانێکی کوشتنـدا گەڕایت، چ لەنێـوان تاکـە کەسدا یان کۆمـەڵـدا ئەنجـام هەر دەگـەیتـه ئەو هۆیانەو هیچی دی .

ـ زۆر بەداخـەوە کە وتـەکـانـت هەمـووی ڕاست و دروستن . . لەگەڵ هەمـوو ئەمانەشدا . . هەڵت نەهێنا بیر لە چی دەکـەمـەوە . . ئازیـزەکـەم . . هێـنـدە واقـیـعـی ئەم بەشـەره ترساندمی . . ئاواتە خوازبووم پڵینگ بوومایه .

ـ بەڕاستی جێی سەرسـوڕمانه . . منیش ختـوورەیێکی وەهـام بە دڵـدا هات . . کاتـێ کە بیـنـیمـیت ئەم پاڵتـۆیـەت لەبـەر دەکرد لە دڵی خۆمدا ووتـم : ئەگـەر ئەم نازدارە پڵینگ بوایە ، ئەم پێستە لە بەریدا لە ئێستاکە جوانترو قەشەنگتر دەبوو .

ـ بەڵام نەکـەی ئاواتـە خواز بیـت تۆش ڕاوچی بوویتـایـە . . چونکـە لە هەنـدێ شەوانـی (قـەدر) دا ئاواتـی مەحاڵ دێتەدی . .

لەنێـوان ووتـەکـانیـدا بە دەستی هەرەشـەی لە ئەدیبەکە کرد . . پەنجەو نینـۆکـە درێژ و سوورەکانی وەك چنگی درنـدە هێنـایـەوە بێـك و پێکـەوە دایانه قاتـای پێـکـەنـیـن . . ئەمـجـا بێـدەنگی‌یـەکی مات هەردووکیـان دادەگـرێـت . . هەروەکـوو جارێکی دیکـە بیـر لەو کلۆڵی و نەهـامـەتی‌یـه جەرگبـڕانه بکەنەوە کە لەودیو شتە هەره جوانەکانەوە خۆیان حەشارداوه .

(١) چیـر وکنـووس کەولی ئاژەڵیکی بەکـارهێناوه ناوی (الفیـزون)ە ڕەنگـە لە چەشنی دەڵـەك و سموره بێ . .